لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

89

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی
مرۆیی لە کوردستاندا

ساڵی هەشتەم
تشرینی دووەمی ٢٠١٥



## لوتکەی ئەدەب ئەوەیە،
## کە مرۆڤ
## شەرم لە خودی خۆی بکات!

**ئەفلاتوون**

RASAN Group



No:

89

تشرینی دووەمی
2015

خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار:

مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فـــارس

زاهـیـــــر زانـــا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محەممــەد هاشــم

وەهـاب حەسـیب

یەحیـــا محەممەد

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر: ئازاد محێدین

بەشی هونەری و دیزاین

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کەلسوم جەلال

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی: شەقامی سالم -

تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ - ٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧

هەولێر: ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine

bryarmagazin@gmail.com

چاپ: پیرەمێرد

دابەشکردن: پەیك/ 07708649210

نرخ: 2500 دینار




# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

سالی هەشتەم - ژمارە 89 - تشرینی دووەمی 2015










## کارگێڕیو بازاڕسازی



# بیربکەرەوە، ئەگەر دەتەوێت سەرکەوتوو بیت!

بیرکردنەوە کلیلی چارەسەرو سەرچاوەی ئیلهامو ڕێگای سەرکەوتنە! بیرکردنــەوە، گەنجینەیەکی لەبننەهاتووە، خاوەنەکەی هەرگیز بۆ هیچ شتێك پەکی ناکەوێت!

خــۆ ئەگەر تەماشــای ژیانی هەمــوو مرۆڤە ســەرکەوتووەکان بکەیــن؛ دەبینین خاڵی هاوبەشــیان بریتییە لە شــێوازو چۆنێتیی بیرکردنەوەیان!

بەڵام بیرکردنەوە کارێکی وەها ســانا نییە! ئەنیشــتاین دەڵێت: بیرکردنەوە کارێکی سەختە، هەر لەبەر ئەمەشە، کە ژمارەیەکی زۆر کەم مومارەسەی دەکەن!

کەواتە: هەرکاتێك گوێبیســتی وتەیــەك دەبیت، کە خاوەنەکەی بــێ بیرکردنەوە دەیدرکێنێــت؛ ئەوا تۆ جگە لــە وتەیەکی بەتاڵی بێنێومرۆك، گوێت لە هیچی دی نەبووە!

ئەو کاتەی مرۆڤەکان بێ بیرکردنەوە دەدوێن، نازانن دەڵێن چی، ئەو کاتەش کە بێ بیرکردنەوە گوێ دەگرن،ناتوانن لەهیچ تێبگەن!

بێ بیرکردنەوە، مرۆڤ ناتوانێت بزانێت لە دەوروبەری چی ڕوو دەداتو چی دەگوزەرێ!

هاوکات بێ بیرکردنەوە، مرۆڤ ناتوانێت ببینێت!چونکە ئەوەی کە دەیبینێت، ئەوە حەقیقەتی شتەکان نییە!

کەواتە: بێ بیرکردنەوە، ئێمە هەموو بەهایەك لەدەست دەدەین!

بیرکردنــەوە ســەرچاوەی هەمــوو بیرۆکەیەکــی گەورەیە، کە سەرکەوتنی گەورەو داهێنانی مەزنی تۆمار کردووە!

هەموو ئەو کارە گەورانەی کە مرۆڤایەتی شانازییان پێوە دەکات، بەرهەمــی بیرکردنەوەی داهێنەرانەی خاوەنەکانیانە! هەرگیز کەس نەیتوانیوە بێ بیرکردنەوەو دۆزینەوەی ڕێگا، بگاتە هیچ ئەنجامێك!

کەواتــە: ئەوەی ئێمــە بە ئامانج دەگەیەنێتو کێشــەکانمان بۆ چارەسەر دەکاتو ئاسۆی نوێمان بە ڕوودا دەکاتەوە، بیرکردنەوەمانە!

زانایــەك دەڵێــت: ســەرکەوتووەکان بە درێــژیو پانیو کێشو بڕوانامەو ڕەســەنی خێزانەکانیــان، پێوانە ناکرێن، بەڵکو بە توانای بیرکردنەوەیان، پێوانە دەکرێن!

ناپلیۆن هێلیش دەڵێت: "بڕی ئەو ئاڵتوونەی کە لە بیروبۆچوونی مرۆڤەکانمــان دەرهێنــاوە، زۆر زۆرترە لــەو ئاڵتوونەی کە لە ناخی زەوی دەرمان هێناون".

کەواتــە: چۆن پــەرە بە بیرکردنەوەمان بدەینو بە شــێوازێکی باشو داهێنەرانە بیر بکەینەوە!؟!

* ســەرەتا پێویستە ژینگەیەکی باشی دەوڵەمەند بە زانیاری بۆ خۆت درووســت بکەیت، ئەویش بە خوێندنەوەیەکی زۆرو بەردەوام، بخوێنەوە، کتێبو گۆڤار بخوێنەوە.

* گوێ لە بیرمەندو شــارەزاکان بگــرەو هەوڵ بدە لە نزیکەوە لەگەڵیاندا بژی؛ تا لە پێشــنیارو بۆچوونەکانیان ســوودمەند بیتو ئاسۆی بیرکردنەوەت فراوانتر بکەن.

* بیرۆکەی جوانو ڕاســت هەڵبژێــرە؛ تا بیریان لێ بکەیتەوەو داهێنانیان تێدا بکەیت.

* کاتێك دیاری بکە بۆ بیرکردنەوە لە ژیانت، لە ئامانجەکانت، لە کارو بەرنامەت لە پرۆژەکانت، دیاریکردنی کات تەرکیزی باشترت پێ دەبەخشێت، بۆ بیرکردنەوە لە شتە گرنگەکان!

* با هەڵســوکەوتو جووڵانەوەت بەپێــی بیرکردنەوەو بیرۆکە درووستەکانت بن.

* سۆزو عاتیفەت تێکەڵ بە بیرکردنەوەیەکی ژیرانە بکەو تەنها ناتوانی بە عاتیفەت بیر بکەیتەوەو بگەیت بە ئەنجامی باش!

* بەردەوام بیربکەرەوە، تەنها جارێكو گەیشتن بەیەك بیرۆکەی جوان، سەرکەوتن درووست ناکەن!

* لــە شــوێنی گونجاودا بیر بکــەرەوەو توانــای بیرکردنەوەت بخــە کار، تــا زێتریش بەردەوام بی، زێتر شــارەزاییو لێهاتوویی لە بیرکردنەوەدا بەدەست دێنیت.

هــاوکات ئازیزانم با چێژ لە بیرکردنەوە وەربگرینو زۆر گەورە تەماشــای بکەیــن؛ چونکە بیرکردنەوە ئاســۆی ژیریو هۆشــیاریو وریایی فراوان دەکاتو ئازادیو ســەربەخۆیی فیکری بۆ خاوەنەکەی دەســتەبەر دەکاتو نایەڵێــت هەرگیز بێتە کۆیلەو کوێرانە شــوێنی کەسانی دی بکەوێت!

هەرکاتێــك تاکەکانــی گەل زانییــان چۆن بیــر دەکەنەوەو بێ بیرکردنــەوە هیــچ هەنگاوێکیان نەنا؛ ئەوســا هەرگیز ئەو وتەیەی هیتلەر نایەتەدی کە دەڵێت: "لە بەختباشــیی دەسەڵاتداران ئەوەیە، کە گەلەکانیان بیر ناکەنەوە!"

خــۆ ئەگــەر بیرکردنــەوە هێنــدە گرنــگ نەبــا، خوداوەنــد نەیدەفەرمــوو ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾

الحشر: ٢١

# کارگێڕی بە گوفتار



هیچ وڵاتێك نابێتە خاوەنی شارستانیەتێکی پێشکەوتوو، تا ئەو کاتەی ئەو پارەیەی لە کڕینی کتێبدا خەرجی دەکەن، زیاتر نەبێت لەو پارەیەی لە چێشتخانەکاندا خەرجی دەکەن.

بەکار

مرۆڤ فێر نابێت، تا ئازار نەچێژێت.

موسیە

تەنها لە کارەکەتدا دڵسۆز بە، دەگەیتە سەرجەم هیواو ئاواتەکانت.

پەندێکی عەرەبی

ئاسانە ببیتە مرۆڤ، بەڵام زۆر سەختە ببیتە مرۆڤێکی مەرد.

پەندێکی ڕووسی

لە سێ کاردا پەلە بکە: کردەوەی چاکە، ئەسپەردەکردنی مردوو، هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەی کە هاوشانتە!

پەندێکی عەرەبی

گەشبین ئەو کەسەیە، کە بۆ چاوەکانت دەڕوانێت، ڕەشبینیش ئەو کەسەیە، کە بۆ قاچەکانت دەڕوانێت.

چسترتۆن



# دەوڵەمەندە وەهمییەکان

برێکــی زۆر ئاڵتوونی هەبوو؛ بۆئەوەی پارێزراو بێت لە ژێر زەوی شاردبوویەوە!

هەمیشــە دڵی لای زێــڕەکان بوو، بەیانیو ئێوارە ســەردانی دەکردنو چاودێری دەکردنو لێیان ڕادەماو دڵی ئۆقرەی نەدەگرت بێ ئەوان!

لەم کەینوبەینەشــدا، دزێك چاودێری دەکردو هەســتی کرد کە ئەم کابرایە شــتێکی گرانبەهای شــاردۆتەوە، تــا ئەو کاتەی توانی شــوێنی ئاڵتوونەکان دەستنیشان بکاتو شەوێك لە شەوان چاڵەکەی هەڵکەندو ئاڵتوونەکەی هەموو برد!

کاتێك کابرا بەمەی زانی، خەمو پەژارە دای گرتو هەناسەی ساردی هەڵدەکێشــاو خەریك بوو شێت دەبوو، هاواری بۆ ڕەنجی بێوەرو سەروەتو سامانی بەفیڕۆچووی دەکرد!

یەکێك لە دراوســێکانی بــەم کارەی زانیو پێــی گوت: هیچ خەم مەخۆ، بڕۆ کۆمەڵە بەردێك کە جێگای ئاڵتوونەکانت دابنێ ئێــوارەو بەیانی ســەردانیان بکەو وابزانــە ئاڵتونە، ئەو بەردانە هەمان کاری ئاڵتوونەکانت بۆ دەکەن؛ چونکە تۆ هەر لە سەرەتاوە سوودت لەو ئاڵتوونانە وەرنەدەگرت!

## لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١. زۆرێك لە دەوڵەمەنــدەکان، دەوڵەمەندی وەهمینو بوونو نەبوونی سەروەتو سامانەکانیان، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت.

٢. ئەو کاتەی زێــڕو زیوو پارەوپووڵ لە دڵی مرۆڤدا جێگیر دەبێتو دەبێتە خولیای شــەوو ڕۆژی، مرۆڤ جگە لە نۆکەرێکی ڕەنجبەخەسار هیچی دی نییە!

٣. ئــەو دەوڵەمەندییەی کە تەنهــا ژمارەیەکە لە بانکەکاندا، جگە لە مەینەتیو دڵەڕاوکێ، هیچ سوودێکی بۆ خاوەنەکەی نییە!

٤. ئەوانەی تەنها پارە کۆ دەکەنەوەو دەروونی پیسیان ڕێگایان پێ نادات؛ بــۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی بەکاری بهێنن، جگە لە کۆیلەیەکی بێکەڵکی پارە، هیچی دی نین!

٥. ئەوانەی تەنها پارە مۆڵ دەکەنو دراو دەخەنە سەر دراوو شــانازی پێــوە دەکەن، دەبێت هەســت بە چی بکــەن، کاتێك بە بەرچاویانەوە کەســانێکی هەژار، لە برسێتیو نەخۆشیدا دەمرن، جا بۆ ئەم کەسانە هەستیان نییە!؟

٦. ئــەم جۆرە کەســانە، ڕۆژی مردنیان کاتــێ میراتەکەیان بەشــدەکرێ ئابڕوویان دەچــێ، ، لە ڕۆژی دوایشــدا تەرازوویان خاڵیو دەستیان بەتاڵە! چەند داماوو لێقەوماوو ڕەنجبەخەسارو ستەمکارن!!

٧. بۆچــی ئــەو پارەیــەی هەمانــە، خۆمانو خــزمو کەسو دەوروبەرمان ســوودی لێ وەرنەگرن؟ تاکــەی هەر بڵێین، خاوەنی ئەوەندە دەفتەر دۆلارەو ئەوەندە پارچە زەویو ئەوەندە ئۆتۆمبیلو ئەوەندە باڵەخانەین، بەڵام خاوەنی دەروونێکی هەژار بینو هەموو تەمەنمان سوالکردنو گەڕان بێ بە شوێن پارەوپووڵدا!

٨. دڵنیابن وەها سەروەتو سامانێك، هەرگیز مایەی پشوودانو حەوانەوە نییە، نە لە دنیاداو نە لە ڕۆژی دوایشدا!

٩. ئەگەر تا ئێستا بیرێکمان لە مامەڵەکردن لەگەڵ پارەوپووڵدا نەکردۆتەوە، باشــتر وایــە گەنجینەکانمان پــڕ بکەین لە بەرد؛ چونکە بۆ کەســێك نەزانێ چۆن ســوود لە ســامان وەردەگرێت، بەردو ئاڵتوون، جیاوازیان نییە!!

89 بڕیار 2015 6



# تەنها بۆ سەرکردەکان

دڕۆو فێڵ و ناپاکی، بریتین لە سێ چاڵ، ئەگەر سەرکردە کەوتە یەکێك لەو سێ چاڵەوە،
ئەوا متمانە لە دڵی شوێنکەوتوانیدا لەدەست دەدات!
(عەمر سەلیم)

ئەگەر ویستت کەشتییەك درووست بکەیت، خەڵکی هان مەدە؛ بۆئەوەی داروتەختەت بۆ کۆ
بکەنەوە، دەستیش مەکە بە دابەشکردنی کارو مەبەستە گرنگەکان، بەڵکو باشتر وایە، کە خەڵکی فێر
بکەیت، چاوەڕوانی بەرفراوانیی دەریای بێکۆتایی بکەن.
(ئەنتوان دی سانت ئەکسوبیری)

داوێنپیسی لە هەر وڵاتێکدا بڵاوبووبێتەوە، چارەنووسی گەلەکەی تەنها تیاچوونە..
(ئەدۆلف هیتلەر)

ئەو ژەنەڕاڵەی بە چاوی کەسانی دی دەبینێت، توانای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی نییە!
(ناپلیۆن پۆناپەرت)

وەکو کوڕی خۆت بۆ شوێنکەوتوەکانت بڕوانە، ئەو کات دەبینیت ئەوان شوێنت دەکەون بۆ ئەوپەڕی
دونیا! وا بزانە شوێنکەوتوەکانت، منداڵە خۆشەویستەکانتن، دەبینیت لە دژوارترین بارودۆخدا،
لە تەنیشتتەوە ڕادەوەستن.
(سن تزۆ)




بەشی چوارەمو کۆتایی

# ئەو کارانەی نابێت لە سەرەتای دەستبەکاربوونتدا، ئەنجامیان بدەیت

### خۆت مەخەرە ناو کەفوکوڵی تووڕەییەوە

لەدەسـتدانی هەستو لەپێستیخۆدەرچوون، نە کارزانییەو نە سەنگینی؛ چونکە لەم کاتەدا، هاوار دەکەیتو بەتوندی دەسـت بە مێزەکەتدا دەکێشیت، یان بۆئەوەی تووڕەییەکەت دەرببڕیت، هەرچی لە بەردەستتدایە، دەیهاوێژیت، سوێندی گەورەوگرانیش لەو لاوە بوەستێت.

بێگومان کەسـانی دیکە، نەك هەر بە چاوی هێزو نەلەخشاوی، بۆ ئەم جۆرە ڕەفتارانە ناڕوانن، بگرە بە چەشنێك لە شێتیو نەشارەزایی لێکـی دەدەنەوە. تۆ بەم جۆرە ڕەفتارە، کارمەنـدەکان ناچار دەکەیت، هەواڵـە ناخـۆشو گرفتـە گەورەکانت لێ بشـارنەوە؛ تا لـە تەوژمی تووڕەیی تۆ بێوەی بن. ئەمجا پاش ئەوەی کات بەسەر دەچێتو دەستت لە بنی هەمانەکە دەردەچێت، هەمیشە دواهەمین کەس دەبیت، کە بە گرفتەکان دەزانیت.

ئەرکی بنەڕەتیی تۆ، ئەوەیە: چارەسـەری گرفتەکان بکەیت، نەك زۆرتریـان بکەیت. ئەمەش ئارامگرییەکی گـەورەو دانبەخۆداگرتنێکی زۆری دەوێت.

لێـرەدا، ئێمـە داوای ئەوەت لـێ ناکەین، ببیت بە فریشـتەیەك، هەروەهـا لە دەربڕینی هەستونەسـتت بەشـبڕاوو بێبەشـت ناکەین؛ چونکـە هەندێك هەڵوێسـت هـەن، ناچارت دەکەن لـە بێهیوایی، یان دڵسـاردی بدوێیـتو دەردی دڵت هەڵبڕێژیت، بـەڵام مەرجە، لێدوانو دەربڕینەکەت، هەر لەسـەر ئەو شتو هەڵوێسـتانە خۆیان بێت، نەك دەوروبەرت، گەرچی تووشی هەندێك هەڵەش بووبن.

### بە مافە تایبەتییەکانت مەنازەو کەڵکیشیان لێ وەرمەگرە

لـە پـڕدا، خـۆت وەك بەڕێوەبەرێکی نـوێ دەبینیتـەوە، توانای دەرنگهاتـنو زووڕۆشـتنەوەت هەیـە، یان سـەعاتێك زۆرتـر، لە کاتی نانخواردندا دیار نامێنیت، یان بۆت دەلوێت، پەیوەندییە تایبەتەکانت، لە نووسینگەکەتدا ئەنجام بدەیت، هەروەها لەبەرئەوەی پلەوپۆستی نوێو چەند هەژموونو دەسەڵاتی بەرفراوانت وەرگرتووە، هەوڵ دەدەیت، ئەم دەسـەڵاتانە، بە شێوازە جۆربەجۆرەکانییەوە، پیادە بکەیتو ئەنجامیان بدەیت، بەڵام دەبێت سوور بزانیت، هەموان چاویان لەسەر تۆیە؛ چونکە تۆ، بۆ هەموو ئەوانەی کارت لەگەڵدا دەکەن، سەرمەشـقو نموونەیەکی زیندوویت، خۆ ئەگەر نەبوویت بە سەرمەشقو پێشەنگ؛ کەسێك نییە، شـوێنت بکەوێـتو پەیڕەویت لێ بـکات. هەروەها بۆت دەسـت نادات، داوا لە کەسـانی دیکە بکەیت، ئەوپـەڕی توانایان بەگەڕ بخەن، گەر بۆ هاندانیان لەسەر زۆرتربەخشینو خۆتەرخانکردن، لەگەڵیاندا نەبوویت.

کاتێك بۆ ڕاپەڕاندنی هەموو کاروبارەکان لە وەختی خۆیدا، بۆ ماوەیەکی درێژتـرو بـە هەوڵێکی زۆرتر کارت کرد، ئەو کاتە، هەر یەکێك لە کەسـانی دەوروبـەرت بگریـت، تـێ دەگات کـە تۆ، چاوەڕێـی ئەم جۆرە بەخشـینو خۆتەرخانکردنـە لـە هەموان دەکەیـت. هیچ کەسـێکیش ڕەزامەندیی تۆی دەسـت ناکەوێت، یان شایستەی پلەبەرزکردنەوە نابێت، گەر بە هەمان ورەو کاریگەرییەوە، کار نەکات.

### هاوسـەنگی لـە نێـوان بەرژەوەندیـی کۆمپانیـاو بەرژەوەندیـی کارمەندەکانتدا ڕابگرە

پێویستە لەسەر هێڵێکی زۆر بەرز -کە بەرژەوەندیی نێوان کۆمپانیاو بەرژەوەندیی کارمەندەکان، لێك دادەبڕێتو جیا دەکاتەوە- بەڕێ بکەویت. خۆ ئەگەر بەحاڵ بەلای بەرژەوەندیی کۆمپانیا لات داو بات دایەوە، هەر لەبەرئەوەی ئاینـدەی ئیشو کارتی تێدا دەبینیتەوە؛ ئەوا کارمەندەکان، بە قازانجپەرسـتو خۆبەرەپێـشو تازەپێداکەوتووت دادەنێن، بەڵام گەر بـە بایەخنەدانو نەرمینواندن، لەگەڵ کارمەندەکاندا ڕەفتارت کرد؛ ئەوا هەر زوو، پاراسـتنی دەسەڵاتەکەت، سەختو نالەبار دەبێتو لێت دەبێت بە کێوی قاف.

هەرگیز نەکەیت، لە شانوشـکۆو ڕێزوپێزی کۆمپانیا دابشـکێنیتو دابەزێنیـت. بـۆ نموونـە: بـە کارمەندەکانت ڕابگەیەنیـت، کە تۆ لە دەرفەتێك دەگەڕێیتو چاوەڕێی هەلێکیت برەخسێت؛ تا بنەوبارگەت بۆ کۆمپانیایەکی دیکە، یان دەزگایەکی دیکە بگوێزیتەوە. دیسـان نەکەیت، پەردە لەسـەر زۆرێك لە تایبەتمەندیو پەیوەندییەکانی دەرەوەی کارت، بۆ کارمەندەکانت لا بدەیتو هەڵبماڵیت.

دیارە جێـی داخە، پەیوەندییـە هاوڕێیەتییەکانـی نێوان خۆتو کارمەندەکان، کە لە پێشـدا هەبوون، ناکرێت پاش پلەبەرزکردنەوەت، وەکـو جاران، بەردەوامییان هەبێت؛ چونکە ئێسـتە بەڕێوەبەریانیتو پێویسـتە بارودۆخی تازە، پەسـەند بکەیت. دەبێت مـاوەو مەودایەك -گەرچی سنوورداریش بێت- لە نێوان خۆتو ئەواندا بهێڵیتەوە.



نووسینی: عبدالله العثمان
و: جەلال عەبدوڵڵا حاجی

# کاری کەمو ئەنجامی مەزن
# ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە..

## ٥- سەردانی نزیکەکانت زیاتر بکە.

دەتوانیـــت ســـەردانی کەســـەنزیکەکانت بکەیـــت، هەریەکە بەجیـــاو پەیوەندیی خزمایەتی بەجێ بگەیەنیت، یان لە کاتێکدا ســـەردانیان بکەیـــت کـــە پێکـــەوە کۆبوونەتەوە، هـــەوڵ بدە لە کۆبوونەوە خێزانییەکاندا بەشـــداربیت، بەم کارە ســـیلەی ڕەحم بەجـــێ دەگەیەنیتو خـــودای گـــەورە بەرەکـــەت دەخاتە ڕزقو ڕۆزیتەوە، تەمەنت درێژ دەکات، بەرەکەت دەخاتە کارەکانتەوە، لە هەر سەردانێکدا، زیاتر لە کەسێك دەبینیت، سەردانو پەیوەندی لە خۆشـــییەکانی ژیانی دونیایە، هەلێکی باشە بۆ پاداشتی خێر، کەســـی باوەڕدار پێوەی پابەندەو پەیوەندیـــی خزمایەتی بەجێ دەگەیەنێتو لە کۆبوونەوەکاندا ئامادەیە؛ چونکە لە نیعمەتەکانی خودای گەورەیە، بەڵام زۆرکەس هەستی پێ ناکەن، سیلەی ڕەحم بەجێ بگەیەنە، بەتایبەتی کۆبوونەوە خێزانییەکان، کە زۆرترین کەسی تێدایە.

## ٦- خوێندنەوەی خێرا

خوێندنـــەوەی خێرا لە هونەرەکانی ســـەردەمەو کاتێکی زۆر دەگەڕێنێتـــەوە، لەجێـــی ئـــەوەی کاتێکـــی زۆر بەخوێندنەوەی کتێبێکـــەوە بەســـەر بەریـــت، دەتوانیت بەنیـــو کاتژمێر تەواوی بکەیت بەهەمان تێگەیشـــتن، لەوانەیە بە تێگەیشـــتنێکی زیاتر، هەروەها هەســـت بەبێ توانایيو ســـەرەگێژە ناکەیت، تۆ ســـوود لە خێرایی بێســـنووری عەقڵو هۆشـــت وەردەگریت، تا خێرایت زۆرتر بێت، تێگەیشتنت زۆرتر دەبێت، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، خـــوی پێوە دەگریـــت، وەبەرهێنان لە کاتدا دەکەیتو ســـوود لە چالاکییەکانت وەردەگریت.

## ٧- پاداشتکردن

پاداشـــتکردن کاریگەریی گەورەی هەیە لەســـەر دەروون، زۆر لەئێمە پێداویستییەکانی خۆی دەکڕێت، بەڵام کەمن ئەو کەسانەی وەك پاداشـــتێك بەکاریان هێناوە، بۆ کارێك تەواوی کردووە، یان دوو پەڕە قورئانی خوێندووە، دەســـتی ســـۆزی بەسەر منداڵێکدا هێنـــاوە، لەبیرمـــە بـــە خودی خۆمم گـــوت: ئەگەر ئـــەم کتێبە بخوێنمـــەوە؛ ئەوا مەدالیایەکت بۆ دەکڕم، کتێبەکەم خوێندەوەو لەسەرم نووسی خوێنەری شـــەیدا، لەدوای ئەم کارەمەوە تێکڕای خوێندنەوەم بۆ سێ هێندە زیادی کرد، پێویستە لە پاداشتکردندا لەگەڵ خۆتدا ڕاســـتگۆبیتو بەڵێنەکەت دوا نەخەیت، هەرچەندە پاداشت زیاد بکات، بەرهەمیش زیاد دەکات.

## ٨- ئامانجەکەت ڕوون بکەرەوە.

هەرچەنـــدە ئامانجەکەت دیاری بکەیـــتو لەبەرچاوت ڕوون بێـــت، زووتر بەدەســـتی دەهێنیتو کاتی بەدەســـتهێنانی کەمتر دەبێتەوەو خۆشـــحاڵتر دەبیت، کاتێك پێت بڵێن: گەشت دەکەین، کەمتردڵخۆش دەبیت، وەك لەوەی بڵێن: ئەم هاوینە گەشت دەکەین بـــۆ مەککە، بەدووەمیان دڵخۆشـــتر دەبیـــت، لەبەرئەوەی ڕوونو دیاریکراوە، گومانو ناڕوونیت لێ دوور دەخاتەوە، مەبەســـتم لە ڕوونیی ئامانج، واتە: ڕوونو دیاریکراو بێت بەنووســـینو بەروار؛ تا وردەکاریی زیاتری ئامانجەکە بنووســـیتو چۆن دەتەوێت پێی بگەیت؛ ئەوا زۆرباشترە بۆ خۆت، خۆشترو سەرکەوتووترە.

## ٩- دوورگەی خۆشبەختی

بنەمایەك هەیە لە زانستی بەڕێوەبردندا، بریتییە لە:

* ٨٠٪ی بەرهەم، بەهۆی ٢٠٪ی کارەوەیە.

* ٨٠٪ی خۆشبەختیت، بەهۆی ٢٠٪ی چالاکییەکانتەوەیە.

* ٨٠٪ی ئـــارامـــيو خـــۆشـــیـــیەکـــانـــت، بـــەهـــۆی ٢٠٪ی پەیوەندییەکانتەوەیە.

* ٨٠٪ی کـــاریـــگـــەریـــت لـــەســـەر خـــەڵـــك، بـــەهـــۆی ٢٠٪ی گوتەکانتەوەیە.

* ٨٠٪ی دڵتەنگیت، بەهۆی ٢٠٪ی کارەکانتەوەیە.

* ٨٠٪ی نەگەیشـــتن بـــە ئامانـــج، بەهـــۆی ٢٠٪ی هەڵوێستەکانتەوەیە.

* ٨٠٪ی خۆشەویستیت، بەهۆی ٢٠٪ی کردەوەکانتەوەیە.

* ٨٠٪ی ســـەرکەوتنەکانت، بەهۆی ٢٠٪ی کاتەکانتەوەیە، کە بەتەرکیزو ئاگاییەوە بەسەری دەبەیت.

تۆ دەبێت ئەو ٢٠٪ـە بدۆزیتەوە، کە کاریگەرە لەسەر ژیانتو پاڵنەرێکی زیاترت پێ دەدات، هەروەها دەبێت بیر بکەیتەوە لەو ٢٠٪ـەی کاتێکی زۆرت لێ دەگرێت بەبێ سوود.



پـلان

سامان کەریم
بەشی سێیەم

# پلانی سەرژمێریی دانیشتوان
## ناوەڕۆکی پلانی سەرژمێریی دانیشتووان

**پارێزگای هەولێر**

پارێزگای هەولێر، پێك دێت لەم بەشانەی خوارەوە:




وێنەی ٦

**پارێزگای دهۆك**

پارێزگای دهۆك، پێك دێت لەم بەشانەی خوارەوە:




وێنەی ٧

**دوو تێبینی گرنگ**

**یەکەم:** گەر لە نەخشەکانەوە سەیر بکەین؛ دەبینین کە ناوەندو قەزاو ناحیەکان، سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرن بۆ سەرژمێریی دانیشتوانو ژمارەی تایبەت بەخۆیان دەبێت. واتە: زیادبوونو کەمبوونی ژمارەی دانیشتوان، لەهەر یەکێك لە ناوچەکان، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەزانین، بۆ هەر ماوەیەك بمانەوێت ئامار دەربکەین (واتە: بمانەوێت ئاماری مانگ، یان وەرز، یان ساڵ) دیاری بکەین، بەڵام گەر ئەم ژمارەبەندییە "الترقیم" نەکەین؛ ئەوا بەجوانی ئاگاداری زۆربوونو کەمبوونەکانی قەزاکان نابین؟ بۆ هەموو بەشێکی ئەم پلانە ئەمە ڕاستە.

ئەمەش گرنگی لەوەدایە، بۆ نموونە بزانین لە چ شوێنێکی سەر بە پارێزگا، هەر کارەساتێك، یان پێش هاتێك بێتە پێشەوە بتوانین مامەڵەی تەندرووستی لەگەڵدا بکەین؟ هەروەها بەم ڕێگایە، دەتوانین بەپێی ناوچەکان ئەولەویەتو لەپێشینەیی بدەین بە هەر بەشێك، کە لەمەودوا، ڕوونتر باسیان لەبارەوە دەکەین؟ وەك (ئاوەدانکردنەوە لە هەموو ڕووەکانەوە بەپێی شوێنی نیشتەجێبوونو زیادبوونو کەمبوونی ژمارەی دانیشتوان، بەشی پەروەردە، لەگەڵ زۆر بەشی دیکە).

**دووەم:** جیاکردنەوەی ناوچەکانو پۆلێنکردنیان بە ژمارە، گرنگیی هەر ناوچەیەکمان بۆ دەردەخات، لە هەموو ڕووەکانەوە بۆئەوەی کاریان لەسەر بکەین، وەك ڕووی (کشتوکاڵی، بازرگانی، پیشەسازی، گەشتیاری، ئاودێری ) زۆر ڕووی دیکەیش. واتە: بۆئەوەی بزانین هەر ناوچەیەك، بە چ شتێك گرنگە، ئەم ژمارەبەندییە سوودی هەیە بۆی، کە وامان لێدەکات بەیەك جار چەندین ستافی بەتوانا لەهەموو بوارەکاندا بخەینە گەڕ، بۆ هەر ناوچەیەك کە هەر بەشێك لەم بەشانە، دەبن بەهۆی زیادبوونی داهات، گەر نەشبن بەهۆی زیادبوونی داهات؛ ئەوا چارەسەری چەندین کێشەی کەڵەکەبوو دەکەین بەم ڕێگایانە، داهاتەکانیشیان، لە داهاتی گشتی بۆ ناوچەکان سەرف دەکرێتەوە، لە بواری (پەروەردە، ڕێگاو بان، شوێنی نیشتەجێبوون، نەخۆشخانە، مزگەوت... هتد)، هەر یەکێك لەم بەشانەش، بەپێی ژمارەی دانیشتوان مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، کە زۆر گرنگە.

**سێیەم: پۆلێنکردنی ناوەندو قەزاو ناحیەکان.**

دەتوانین جارێکی تر ژمارەبەندییەکە بۆ ناوەندو قەزاو ناحیەکان بکەینەوە، بەڵام ئەم جارە بە پۆلێنی (ناوەندی ناوەندو بەشەکانی دەرەوەی ناوەند) کە لە ژمارە (٠١) بۆ (٩٩) وەردەگرێت؛ بۆئەوەی جارێکی دی کارەکەمان زانستی بێت. واتە:

جارێکی دی، ژمارەبەندیی ناوەندو قەزاکان دەکەینەوە، بەڵام بەپێی سنووری جوگرافیی هەموو ناوچەیەك بەش دەکرێت، واتە: ڕەنگە ناوچە هەبێت، تەنها دوو ژمارە وەربگرێت لە (٩٩) ژمارە، گرنگ ئەوەیە، کە ئێمە دابەشکاریی بۆ دەکەین، تا ژمارە (٩٩). لەبەر ئەوەی شێوازێکی زانستیمان پێ دەبەخشێت. لەبەرئەوەی ناوچەکان زۆرن، بۆیە جارێکی دی بە ژمارەبەندیی سەدی کارەکەمان ئەنجام داوە؛ بۆئەوەی پلانەکەمان بۆ چەندین ساڵ، بێ کێشە بێت.

### پۆلێنکردن

ئەمەی کە لەوێنەکەی خوارەوەدا دەیبینن، ناوەندی سلێمانییە وەك ئاماژەمان پێدا پێشتر، واتە: ناوەندی سلێمانی جارێکی دی ژمارەبەندی دەکەینەوە بۆ چەند بەشێك، وەك لێرەدا دەیبینین کردوومانە بە پێنج بەشی سەرەکییەوە.



وێنەی ٨

### تێبینیی گرنگ:

لە ڕاستیدا من هەموو ناوچە نیشتەجێبوونەکانی ناوەندی سلێمانیم نەدەزانی، بۆیە کردوومە بە پێنج بەشەوە ئەگەرنا هەر ناوەند، یان قەزای پارێزگایەك چەند ناوچەی نیشتەجێبوونی تێدا بێت، دەبێت ئەوەندە ژمارەی تێدا بێت، یان دەکرێت بەوەندە ژمارەوە، واتە: گەر ناوەندی سلێمانی، کرا بە (٢٠) ناوچەی نیشتەجێبوونەوە، ئەوا لەبری (٥) ژمارە، (٢٠) ژمارە وەردەگرێت.

ناوەندی سلێمانی کۆدەکەی بریتیە لە (٠١٠١)/ پێك دێت لەم بەشانەی خوارەوە، کە لە وێنەکەدا ڕوون کراوەتەوە.




**ڕوونکردنەوەی گرنگ:** لە دابەشکاریی ناوەندی سلێمانیدا، ناوچەکانم بۆیە بە ڕەنگ نووسی، وەك ناوچەی سەوزو پەمەیی‌و سوورو شین، لەبەرئەوەی دەبێت ئەوکاتەی کە بڕیاری جێبەجێکردنی ئەم پلانە دەدرێت، لەگەڵ پارێزگاری پارێزگاکان‌و شارەوانیی هەر سێ پارێزگاکە، لەسەر نەخشەی ڕاستەقینە بزانین هەموو ناوچەکانی نیشتەجێبوون لەسەر نەخشە ناویان چییە؟ هەروەها دیاریکردنی ئەم ناوو ژمارەبەندییەش، بەپێی ڕێکەوتنی هەموو لایەك دەبێت؛ بۆئەوەی هیچ هەڵەیەك لە کاتی جێبەجێکردندا ڕوو نەدات.

### چوارەم: پۆلێنکردنی کۆتایی.

مەبەستمان پێی، پۆلێنکردنی گەڕەکەکانە کە دابەشبوون بەسەر ناوەندو قەزاکانی هەر سێ پارێزگاکەی هەرێمدا، کە جارێکی دی ژمارەی سەدی بەکار دەهێنین لەبەر زۆریی ژمارەی گەڕەکەکان لە ناوەندو چەند قەزاو ناحیەیەکی پارێزگاکاندا.

کەواتە: ژمارەی کۆتاییمان، دەبێت بە ژمارەیەکی هەشت ڕەقەمی، کە دەبێت بە ژمارەی شوێنی نیشتەجێبوونی هەر خێزانێك‌و ژمارەی نوێیەم دەبێت بە کۆدی خێزان، کە لە ژمارە یەکەوە دەست پێ دەکات تاکو ئەو ژمارە خێزانەی کە لەو ناوچەی نیشتەجێبوونەدا بوونیان هەیە.

### ١/ پۆلێنکردنی گەڕەکەکان.

گرنگیی ئەم پۆلێنکردنەی کۆتایی، بۆ جێگیرکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی هەر خێزانێکە، واتە: هەر خێزانێك ژمارەی جێگیری خۆی دەبێت بەم ژمارەبەندییە، ئەوەی زیادو کەم دەکات، ژمارەی خێزان‌و هاوڵاتییە، هەر خێزانێکیش بەپێی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی، مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

ئەم وێنەیەی خوارەوە، ڕوونکردنەوەیە سەبارەت بە ناوەندی سلێمانی، کە دەبێت بە گەڕەکەکانی ناوەندی شاری سلێمانی کە ژمارەیان بەتەواوی نازانم، بەڵام لەوێنەی دواتردا، ئاماژە بە سێ دانە دەکەین.



لەوێنەی ژمارە (١١)دا تەنها سێ گەڕەك باس دەکەین چونکە ژمارەی گەڕەکانی ناو سلێمانی زۆرن بۆیە تەنها ئاماژە بە سیان دەکەین.




وێنەی ١١

تێبینی گرنگ. بۆ ژمارەبەندیی گەڕەکەکانیش دەتوانین بەچەند ڕێگایەك گەڕەکەکان ژمارەیان بۆ دابنێین، یان لەکۆنترین گەڕەکەوە دەست پێ دەکەین بۆ تازەترین گەڕەك، یان بەپێی زۆریی ژمارەی دانیشتوانی هەر گەڕەکێك، یان بەپێی پیتەکان ئەلفبێ، ژمارە بۆ هەرگەڕەکێك دیاری دەکەین، یان ئەمەش بەسیستمی چەقی بازنەیی، لە ناوەندی گەڕەکەوە، بۆ کۆتایی دەست پێ بکەین، یان هەموو خاڵەکانی سەرەوە بکەین بەیەك‌و بیکەین بە پێوەری ژمارەبەندییەکە.



ئا: ئەسكەندەر ڕەحیم

# چۆن مامەڵە لەگەڵ ئافرەتی کڕیاردا دەکەیت؟

چۆن باوەڕ بە ئافرەتێك دەهێنیت؛ تا شمەكێكت لێ بكڕێت؟

زۆرێك لە فرۆشیاران، وای بۆ دەچن، کە ئافرەت هەڕەمەکیو سەرپێییانەو بەپێی هەستو سۆزی، شمەكو پێداویستییەکانی دەکڕێت، بەڵام لە ڕاستیدا، لە هەڵبژاردنی شمەكو کڕینیدا، ئافرەت شێوازو پاڵنەری تایبەت بە خۆی هەیە. جا ئەگەر تۆ فرۆشیاریت، کۆمەڵێك خاڵ هەیە، کە دەبێت ڕەچاویان بکەیتو لە کاتی مامەڵەو سەودا، لەگەڵ ئافرەتدا، ئاگات لێیان بێت، ئەوانیش:

**١. چاك بزانە، کە ژیانی ئافرەت، بە دەوری پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا دەسووڕێتەوە:**

تۆی فرۆشیار، نابێت هەر لە پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ئەودا، خۆت قاڵ بکەیتەوە، بەڵکو دەبێت بەدەم پێداویستیی کەسانی دەوروبەریشییەوە بیت، وەکوو: هاوڕێیەکانی، ئەندامەکانی خێزانەکەیو هاوسێییەکانی.

**٢. ئاگات لە پاڵنەرەکانی کڕینو فرۆشتن بێت:**

دڵنیای بکەرەوە لەوەی کە تۆ، بەڕاستی دەتەوێت یارمەتیی بدەیت. ئەو شمەکەشی پیشانی دەدەیت، گونجاوترینو باشیترین شتە بۆ ئەوو ئەم خستنەڕووی شمەکە، بە هەڵێك نازانیت، تا خێرا مامەڵە ببڕێنیتەوەو قۆڵی ئەوی پێ ببڕیت.

**٣. وردەکارییەکانی پێ بڵێ:**

ئەو وردەکاریو زانیارییانە بخەرە ڕوو، کە خانمی کڕیار، حەز بە زانینیان دەکات، گەر کڕیارت زۆربوون، لە تویێی پەڕەیەکدا، یان زیاتر، وردەکارییەکانی پیشان بدە، تا بیخوێنێتەوە.

**٤. پەلەی لێ مەکە:**

گەر دەست لە شمەکەکە دەدات، ڕێگەی بدە، بەر لە کڕینی، تاقی بکاتەوە، تا دڵی ساغ ببێتەوە.

**٥. متمانەو دڵنیایی پێ بدە:**

ئافرەت، قسەو ڕای ئەوانەی متمانەی پێیان هەیە، بەهەند وەری دەگرێت، لەبەرئەوە بەبێ درووستکردنی متمانە، هەرگیز ناتوانیت، باوەڕو قەناعەت بە ئافرەتێك بهێنیت؛ تا شمەكێكت لێ بکڕێت.

**٦. پەیوەندیت پتەو بکە:**

ئەگەر یەکسەری شمەکی لێ نەکڕیت؛ ئەوا پەیوەندییەکەت لەگەڵیدا بپارێزە؛ تا متمانەی بە بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانت توندوتۆڵ بکەیت. پاش کڕینیش دڵنیای بکەرەوە، کە دەتوانێت بۆ دابینکردنی ئەو شمەكو بەرهەمانەی تۆ هەتەو ئەو دەیەوێت، پشت بە تۆ ببەستێتو خەمی هیچی نەبێت.

**٧. بەهرە هەمەجۆرەکانی بدوێنە:**

ئافرەت دەتوانێت لە زۆر کاردا، سەرکەوتوو بێت، هەمیشە بەدوای چەندان شێوازی نوێدا دەگەڕێت؛ تا بەئاسانیو بەخێرایی، کارەکانی خۆی پێ ڕاببپەڕێنێت. بۆ ئەم مەبەستە، چاك وایە، کە هەندێك لەو شێوازانەی بۆ بخەیتە ڕوو.

**٨. بەخێرایی سەرنجی ڕابکێشە:**

ئافرەت، هەمیشە سەرقاڵەو هەوڵ دەدات؛ تا هاوسەنگی لە نێوان ژیانی خێزانداریو کارەکەی ڕابگرێتو ئەرکە جۆربەجۆرەکانی پێکەوە بسازێنێت. هەر لەبەرئەوەیە، خێرا چاو بۆ شمەکەکە دەگێڕێتو ئەوەت لێ چاوەڕێ دەکات، کە لە گەڕان بۆ شمەكو کڕیندا، ئاسانکاری بۆ بکەیت. خۆ ئەگەر لە سەرنجڕاکێشانیدا خێرا نەبوویت؛ ئەوا بەدوای شوێنێکی دیکەدا دەگەڕێت، تا زانیاریی درووست وەربگرێتو ڕێز لە کاتی بگرێت.

**٩. گفتولفتت جوان بێت:**

شتێکی ئاسایی پێ مەفرۆشە، بەڵکو لە بەرچاویدا وەها بدوێ، کە دەستخستنی ئەم شمەکە، خەونێکی ئەوەو تامەزرۆی بەدیهێنانیەتی. لێی بگەڕێ، تا بیهێنێتە بەر چاوی خۆی، کە چەندە ئەم بەرهەمەی تۆ، ژیانی ئاسانترو باشتر دەکات.



# هەستێك بۆ بڕیار

ڕۆژان عبدالرحمن

هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە، شەیدای خوێندنەوە بووم، جا خوێندنەوەی هەرچی بوایە، هەرچیم بەردەست بکەوتایە، دەمخوێندەوە.

لە قوتابخانەدا، لە پانزەی زانستی بووم، کچێك بوو بە هاوڕێم، بە تێپەڕبوونی کات بووین بە خۆشەویسترین هاوڕێی یەکتری، هاوڕێکەم دەیزانی کە زۆر شەیدای خوێندنەوەم، گۆڤارێکی پێ ناساندم، کە مانگانە دەردەچوو، هەر لە یەکەم خوێندنەوەدا، هەستم بە چێژێکی زۆر کردو سەرنجی ڕاکێشام، تا وای لێهات، هەموو مانگێك خۆم سەردانی کتێبفرۆشییەکانی بەردەکی سەرام دەکردو دەمکڕی. ئەو گۆڤارە گۆڤاری "بڕیار"بوو، گەورەترین کاریگەری هەبوو لە ژیانمدا.

لە کاتێکدا کە لە پۆلی دوانزەی زانستی بووم، زۆرجار پێویست بوو مەلزەمە بکرم، یان کۆپی بکەم، ئیتر من لە پاڵ هەر مەلزەمەکڕینو کۆپیکردنێکدا، گۆڤارێکی بڕیارم دەکڕی. گۆڤاری بڕیار ئەوەندە کاری تێکردم، لە هەموو بوارەکانی ژیانمدا ڕەنگی دایەوە، هەر لە بواری خوێندنو قوتابخانەوە، بگرە تا بواری کۆمەڵایەتیو هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوڕێو دراوسێدا، تەنانەت لەسەر شێوازی قسەکردنو ئەو وشانەی کە لە قسەکردندا پێویست بوو، بیان سڕمەوە، یان ئەو وشانەی پێویست بوو، بیانهێنمە ناو قسەکانمەوە، کاریگەری لەسەرم هەبوو، بڕیاڕ وای لێکردم، کە هەردەم بڕوام بە خۆم هەبێت، قەت بێهیوا نەبم، هەر ئەو نووسینە کورتو پڕواتاو جوانانەی کە لە بڕیاردا چاپ دەکرێن، بە شێوەیەك دەبنە هۆی گوڕانکاری لە ژیانی مرۆڤدا، کە نە هەست بە گوشارو ماندووبوون بکات، نە بڵێ: ئەمە قورسەو بە من ناکرێ، ئەو نووسینانە، ئەو وێنانە، ئەو ژیاننامانە بەگشتی، ئەو بابەتانەی ناو گۆڤاری "بڕیار"، وردە وردە ژیانی منیان گۆڕی من هەستم کرد، دەتوانم ببم بە کەسێکی تر.

من کچی خێزانێکی موسڵمانم، نوێژم دەکردو ڕەمەزانان بەرۆژوو دەبووم، بەڵام کچێك بووم بێ سەرپۆش و جلوبەرگی شیاوی ئافرەتانی موسڵمان لە ماڵ دەچوومە دەرو بۆ قوتابخانەو بازاڕو بۆ هەموو شوێنێك، هەر بەو شێوەیە دەڕۆیشتم، یەکێك لەو کاریگەرییە باشانەی کە گۆڤاری بڕیار لەسەر من هەیبوو، ئەوە بوو کە ببم بە باڵاپۆش..

گۆڤاری بڕیار بەرەبەرە شیرینی باڵاپۆشی پێ بەخشیم... بەرە بەرە وای کرد، حەز لە باڵاپۆشی بکەمو لە (٢٠١٥/٢/٢٥) بووم بە باڵاپۆشو بڕیارم دا، هەتا ماوم باڵاپۆش بمو یارمەتی کەسانی تریش بدەم؛ تا ببن بە باڵاپۆش.

هیوای تەمەندرێژی بۆ ستافی گۆڤاری بڕیار دەخوازمو داواکارم لە خوای گەورە، پاداشتی بەخێرتان بداتەوە....

# نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازاڕسازی ڕایەڵەدا

# (نێتۆرك مارکێتینگ)

## سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژدا

**نێتۆرکی مارکێتینگ چییە؟ پێشینەی نێتۆرکی مارکێتینگو گەشەکردنی**

لـە حەزە زیادبووەکان لە دونیـادا، حەز بە هەبوونی "کاری داراییە"، خەڵکی سەرانسـەری دونیـا وردەوردە پەی بە گرنگیی ئـەم خاڵە دەبەن کە خاوەنـی کاری خۆیانو خاوەنی خۆیان بن. هـەر بەو شـێوەیەی کە (ج.پاوڵ گیتی) چەند سـاڵێك پێشـتر، نیشـانی دا، "بۆ بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتنی واقیعی لە ژیاندا، پێویستە خاوەنی کاری خۆمان بین". تەنها ئەو کاتەی کە خاوەنی خۆتانن، بابەتەکانی ژێرەوە لەژێر کۆنترۆڵتاندا دەبن:

١- لە کوێ کار بکەن؟

٢- لەگەڵ چ کەسێکدا کار بکەن؟

٣- چۆن کار بکەن؟

٤-پێویستە داهاتتان چەند بێت؟

پێشـبینی هەبوونی کارێك، زۆرینەی خەڵك دوچاری ترسو سـترێس دەکات، ئەوەش بۆیان دەبێت بەهـۆی هاتنە دەرەوە لە "ناوچـەی ئـارام"(comfort zone)ی خـودو ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ پێشـهاتی پێشـبینی نەکراوو مەترسیی جۆراوجۆر، بەڵام سـەرباری هەموو ئەمانە، هەبوونـی کارێك کە بەتەواوی حەزی خۆمان بێت، تەنها ڕێگایەکە کە دەتوانین پشتبەستن بە خۆمانو هەلومەرجـی گونجاومان بۆ فەراهـەم دەکاتو لە ڕووی داراییو ڕووەکانی دیکەیشـەوە بە سـەرکەوتنی حەتمیمـان دەگەیەنێت. توێژینەوەکان ئەوە نیشـان دەدەن، کـە تەنها ١٪ی خەڵکی دونیا دەوڵەمەندن. لەم ژمارەیە، ٧٤٪ خاوەنی کاری خۆیانن.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، لە هەر ١٠ چرکەدا، کارێکی ماڵیی



نوێ درووست دەبێتو نزیکەی ٢ ملیۆن ئەمریکایی لەڕێگەی کارە ماڵییەکانەوە، دەرامەتگەلی چەند ملیۆن دۆلاری بەدەست دەهێنن.

باشترینو ئاسانترین ڕێگا بۆ دەستپێکردنی کارێکی ماڵی، بریتییە لە نێتۆرکی مارکێتینگ (NM). لەم سەردەمەدا وشەی نێتۆرکی مارکێتینگ کەوتۆتە سەر زمانو زۆرینەی خەڵکی دونیا بیستوویەتی. خەڵك، چ ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، چ لە ڕێگەی کڕینی بەرهەمەکان لەو کەسانەی کە کاریان بریتییە لە نێتۆرکی مارکێتینگ، لەگەڵ ئەم بازرگانییەدا سەروکاریان هەیە.

نێتۆرکی مارکێتینگ، شێوازێکە بە ٥٠ ساڵ پێشینەوە. ٧/٧ ملیۆن کەس لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەم شێوازەوە سەرقاڵنو حاڵی حازر ئەم کارە لە ١٢٥ وڵاتی دونیادا برەوی هەیە. تا ئەم مێژووە، لە ماوەی هەر هەفتەیەکدا، ١٥٠ هەزار کەس لە سەرانسەری دونیادا لە کارکەرانی ئەم شێوازە کارە لە حاڵی زیادبووندان. ئەم ژمارەیە تێکڕای ٢١٤٠٠ کەسە لە هەر ڕۆژێکدا.

بە پشتبەستن بە قسەی جۆن کالنچ (John Kalench) نووسەرو نێتۆرکەری بەناوبانگ، "NM" گەورەترین دەرفەتە لە درێژایی مێژووی دونیادا."نێتۆرکی مارکێتینگ تەوژمی ئایندەی دونیایە!

نێتۆرکی مارکێتینگ ڕێکارێکی دابەشکردنی بەرهەمەکانو خزمەتگوزارییەکانە بە هەتا کۆتا کڕیار. ڕێکارێکی تایبەت بۆ دابەشکردنی کاڵاو بازاڕخستن NM. ئاوێتەیەکە لە {دوو توانا} مافی نوێنەرایەتیو دەرامەتی هەڵکشاو. مەرجی سەرمایەی سەرەتایی کەمو مەترسییەکی زۆر کەمە. لەم ڕۆژەدا، ئینتەرنێت بەو ڕۆڵە بەرچاوەی کە لە دونیادا دەیگێڕێت، ڕادەی بازرگانی ئەلیکترۆنی(e-commerce) زیاد کردووە. هەر ئەم کارەش سەرکەوتنی NM بەتەواوی بەدی هێناوە.

زۆرینەی کۆمپانیا سەرەکەتووەکانیش، {لە پاڵ ڕێکاری کۆنی دابەشکردن} سوود لە NM وەردەگرن بۆ دابەشکردنی کاڵاو خزمەتگوزارییەکانیان. ئەم کۆمپانیایانە بریتین لە کۆکاکۆلا (Coca Cola)، جیلێت (Gillette)، کۆلگەیت-پاڵمۆلیف(Colgate-Palmolive)، ئێم.سی.ئای (MCI)، سپرینت (Sprint)، ئەی.تی.ئەندتی (AT&T)، ڕیکساڵ (Rexall) ، پێریمێریکا (Perimerica)، ئای.بی.ئێم (IBM)و جەنەراڵ مۆتۆرز (GM).

شێوازی NMبۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٤٥ لەلایەن کارگەی تەواوکەرە خۆراکییەکانی نوتریلیت (Nutrilite Food Supplement Corporation) لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەکار هێنرا. ناوی ئەم شێوازە، بەدرێژایی ساڵانی ڕابوردوو لە"شێوەی فرۆشتنی ڕاستەوخۆ" بە"بازاڕسازیی چەند ئاستی، یان چەند لایی (MLM)"، "بازاڕداری ڕایەڵە"و"بازاڕسازیی ڕایەڵەی ئەلیکترۆنیك" کامڵ بووە. بنەمای ئەصڵیو بنچینەیی هەموو ئەمانە یەکەوە، هیچ جیاوازییەکی نییەو بریتییە لە دابەشکردنو بازاڕداری بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان. لە ساڵی ١٩٩٥، لە سەرانسەری دونیادا، بڕێك بە تێکڕایی ١٠٠ ملیارد دۆلار لە کاری NM لە ئاڵوگۆڕدا بووە. پێشبینی دەکرێت ئەم ژمارەیە، لە ١٠ ساڵی ئایندەدا، بگات بە ٧٠٠ ملیارد دۆلار. حاڵی حازر ٢٥ملیۆن کڕیاری چالاك لە زیاتر لە ١٢٥ وڵاتی دونیاوە بەم کارەوە سەرقاڵنو ئەم ژمارەیەش بە شێوەیەکی بەردەوام، ساڵانە ١٠٪ زیاد دەکات.

وڵاتانی پێشەنگ لە NM، هاوکات ڕێژەی دانیشتوانیان کە ئەم شێوازە بەکار دەهێنن، بریتین لە:

| | |
|---|---|
| کەنەدا | ٢٪ |
| ژاپۆن | ٣٪ |
| مەکسیك | ١٪ |
| تایوان | ٨٪ |
| بە ریتانیا | ١٪ |
| ویلایەتە یەکگرتووەکان | ٢٪ |

ژمارە نمایشکراوەکان نیشاندەری ئەوەن، کە شێوازی NM ئەو کات نوێ بووە، چونکە ئەم ئامارە لە ساڵی ٢٠٠٢ ئەنجام دراوە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی سیازدە ساڵ بەسەر ئەو سەرژمێرییەدا، ئامارەکان ئاماژە بە بەرەوپێشچوونێکی باش دەکەن لەو بوارەدا.. بەشێوەیەك کە لە ئامارو داتای ساڵی ٢٠١٥دا، ڕێژەکە زۆر زیادی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو سەرچاوەکان، ئاماژەیان بەوە کردووە، کە ئەم ئامارانە بە نزیکی دانراون؛ چونکە هێشتا ساڵی ٢٠١٥ تەواو نەبووە.

ئاماری ٢٠١٥

| بۆ ساڵی ٢٠١٥ | |
|---|---|
| ئوستراليا | ٢٥٪ |
| کەنەدا | ٣٦٪ |
| ژاپۆن | ٥٠٪ |
| مکسیک | ١٠٪ |
| تایوان | ٦٧.٥٪ |
| بەریتانیا | ٤٨٪ |
| ئەمریکا | ٥٠٪ |

نێتۆرکی مارکێتینگ، بەڕاستی لە حاڵەتی بڵاوبوونەوەدایە بە هەموو شوێنێکی دونیاداو ژیانگەلی بێشوماری لە سەرانسەری دونیادا سازکردووە.

شێوازی NM لە ڕاستیدا لە هەموو جێگایەکدا ئەم ئومێدە دەدات، کە دەتوانن دەرامەتیان زیاد بکەنو شێوەی ژیانیان باشتر بکەن.

لە مەیدانی نێتۆرکی مارکێتینگدا، هەتا دڵتان بیەوێت داستانگەلی موعجیزەئاسا لەبارەی دەوڵەمەندبوونی کەسانی دەستکورتەوە، دەبینیو دەخوێننەوە.

NM لە پڕداهاتترین کارەکانی دونیایە. بە گوزارشی"گۆڤاری SUCCESS"، "نێتۆرکی مارکێتینگ" بەهێزترین ڕێکاری دەست گەیشتنە بە کڕیار لە دەیەی ١٩٩٠و دوای ئەوەوە.



بڕیاری منداڵان

پەیام

# هەرگیز بۆ سەروو خۆت مەڕوانە!

هێمن «لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو، ڕۆژێکیان بەسەرسوڕمانەوە بۆ ئاسۆی هاوڕێی ڕوانی، کە لە تەنیشتی خۆی دادەنیشت، بە پێنووسێکی نوێو جوانو سەرنجڕاکێش وانەکانی دەنووسییەوە، پاشان سەیرێکی پێنووسەکەی دەستی خۆی کردو ئاهێکی هەڵکێشاو سەرێکی ڕاوەشاندو بەحەسرەتەوە لەبەرخۆیەوە گوتی: هەموو ڕۆژێك ئاسۆ بە جلوبەرگێکی نوێو پێنووسێکی نوێوە دەردەکەوێت، خۆزگە منیش وەکوو ئەو دەوڵەمەند بوومایەو بمتوانیایە هەر ڕۆژەی بە پێنووسێکی نوێ بنووسم.. پاشان گوتی: خودایە بۆچی من لە خێزانێکی هەژارو نەدارو کەمدەرامەت لەدایك بووم؟؟!! بۆچی ژیانو گوزەرانی زۆرینەی هاوڕێکانم ژیانێکی لێوان لێوە لە سەروەتو سامان! بەڵام من منداڵی ماڵێکی هەژارمو بێبەشم لەو هەموو خۆشیو ڕەفاهیەتە!!

چەندە حەزم دەکرد جلوبەرگی منیش وەکو جلوبەرگی ئەوانو پێنووسی منیش هاوشێوەی پێنووسەکانی ئەوانو پاسکیلو یاریو پلەیستەیشنو تۆپی باشم هەبووایە، هەروەکوو هاوڕێکانم!

لەناکاو خەیاڵاتەکانی پچڕاو هاتەوە نێو پۆل، بیری لە قسەو ئامۆژگاریی مامۆستاکەی کردەوە کە هەمیشە دەیگوت: **(ڕۆڵەکانم، هەرگیز مەڕوانن بۆ سەروو خۆتان، بەڵکو بڕوانن بۆ ئەوانەی باروگوزەرانیان لە ئێوە خراپترە)!**

هێمن کاتێك ئەم ئامۆژگارییەی بەبیر هاتەوە، بە خۆی گوت: بەسە بۆ من کە فێرخوازێکی سەرکەوتووم، ڕاستە من لە ڕووی ئابوورییەوە، لە ماڵێکی هەژاردا ژیان دەگوزەرێنم، بەڵام لە ماڵێکدام کە لێوانلێوە لە سۆزو میهرەبانی، کە بنەمای ماڵەکەمان لەسەر خۆشەویستیو ڕێزگرتنو ئاسوودەیی بنیاتنراوە! پاشان زەردەخەنەیەکی کردو بەئاگا هاتەوە، ترسا لەوەی کەسێك چاوی لێبووبێت کە خەیاڵی ڕۆیشتووە، دوای تەواوبوونی دەوام، هێمن بەخێرایی بەرەو ماڵ ڕۆیشتەوە، بەڵام جیاواز لە ڕۆژان، ئەمڕۆ نیگەرانو خەمبار بوو، کاتێك گەیشتە ماڵەوە، جیاواز لە ڕۆژان جانتاکەی فڕێ داو سەری خستە سەر ئەژنۆکانیو دەستی کرد بە گریان!

دایکی زۆر هەوڵی دا هێوری بکاتەوە، لێی پرسی کوڕی شیرینم، چی ڕووی داوە بۆچی دەگریت؟

هێمن گوتی: هیچ شتێك نەبووە، تەنها کەمێك سەرم ئازاری هەیە!

دایکی ڕۆیشت، چایەکی گەرمی بۆ هێنا، بەڵام ئەسرینەکانی هێمن وەکوو دڵۆپەباران هۆنهۆن دەهاتنە خوارەوە، پاشان هێور بووەوەو کەمێك بیری کردەوەو دووبارە لە خۆی پرسی: بۆچی ئەم کارەم کرد، لە کاتێکدا خودا فەرمانی کردووە، کە دەستپاکو ئەمیندار بینو یەکدیمان خۆشبوێت! دواتر بەهێواشی جانتاکەی کردەوەو سەیرێکی کرد، پێنووسە سوورە لەعنەتییەکەیە!

هەوڵی دا بیگرێت بە دەستییەوە، بەڵام هەستی دەکرد پارچەیەك ئاگری بە دەستەوەیە! جانتاکەی داخستەوەو چەندجارێك سەری ڕاوەشاندەوە!

بە خۆی دەگوت: باشە ئەگەر سبەی ئاسۆ پرسی: ئایا تۆ پێنووسە تازەکەی منت نەبینیوە، چی پێبڵێم؟ بەدەم ئەو قسانەوە چاوەکانی چووە خەوو بەتەواوی خەوی لێکەوت!

بۆ سبەی کاتێك بە ئاسۆ گەیشت لە قوتابخانە، نەك هەر پرسیاری پێنووسەکەی لێ نەکرد، بەڵکو بە ڕوویەکی خۆشەوە، پێشوازی لێکردو بانگهێشتی کرد بۆ خوانی ئێوارە! پاشان هێمن سەیرێکی ئاسۆی کردو لەبەرخۆیەوە گوتی: ئەگەر دەزانیت ئەو کەسەی بانگهێشتی دەکەیت، دوێنێ چی لەگەڵدا کردوویت؟

خۆ ئەگەر بتزانیایە چ تاوانێکی بەرامبەر کردوویت، هەرگیز بانگهێشتت نەدەکرد؛ چونکە هێمنی هاوڕێت دزە، جەردەیە! دزی لێکردوویت!

دوای تەواوبوونی دەوام، هێمن گەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام ئەمڕۆ حاڵی کەمێك باشتر بوو لە دوێنێ، داوای مۆڵەتی لە دایكو باوکی کرد؛ تا ڕێگەی بدەن؛ بۆ ئێوارە بڕوات بۆ دەعوتەکەی ماڵی ئاسۆی هاوڕێی!

دایكو باوکی ڕێگرییان لێ نەکرد، بەپێچەوانەوە بڕێك پارەشیان پێ دا؛ بۆئەوەی دیارییەکی خنجیلانە بۆ ئاسۆی هاوڕێی بکڕێت، هێمن بەم هەڵوێستەی دایكو باوکی، زۆر دڵخۆشبوو، پاشان دیارییەکی بۆ ئاسۆ کڕی، دواتر پێنووسەکەی بە دەستەوە گرتو نووسی هاوڕێی ئەزیزم ئاسۆ: هیوادارم خۆتو خانەوادەت هەموو ساڵێك پێکەوە بە خۆشی ژیان بگوزەرێنن.. هیوای ژیانێکی ئاسوودەو لێوانلێو لە سەرکەوتنو بەختەوەریت بۆ دەخوازم، هاوڕێکەم دەزانم کاتێك ئەم دیارییە سادەیە هەڵدەپچڕی سەرت سوڕدەمێنێت؛ چونکە لەگەڵ دیارییەکەمدا، پێنووسێکی سوری جوان دەبینیت، لە ڕاستیدا نازانم چی بڵێم؛ چونکە لە شەرمەزاریدا دەتوێمەوە! تکات لێدەکەم بمبوورە لەو هەڵەیەی کردم!

بۆ ڕۆژی دواتر هێمنو ئاسۆ سەرقاڵی شیکاری ڕاهێنان بوون، هەر یەکێکیان بە پێنووسێکی سوری تازەو جوان! زەردەخەنە لە چاوەکانیان دەباری!

سەرچاوە/ http://haybinyakzhan.blogspot.com/



# خواردنەوە کهوولییەکان ٢\١

ن: د. حسان شمسی پاشا

و: یەحیا محەممەد عەلی

**١- مەترسییەکانی خواردنەوە کهوولییەکان:**

خواردنـــەوە یەکێکـــە لەکێشـــە گەورەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەشـــێوەیەك ئێســـتا، دوای جگەرەکێشـــان، بە دووەم هۆکاری مـــردن دادەنرێت لە ئەمریکا، هەروەها بڕی ئەو زیانە ئابوورییانەی لە ئەمریکا دەکەوێت بەهۆی خواردنەوە کهوولییەکانەوە، دەگاتە زیاد لە (١٠٠ ملیار)دۆلار لە ساڵێکدا.

لە توێژینەوەیەکی نوێی کۆلێژی شـــاهانەی پزیشکیی بەریتانیادا هاتووە: (مرۆڤ هیچ شـــتێکی نەدۆزیوەتەوە، هاوشـــێوەی کهوول خۆشـــیی (کاتیی) پێ ببەخشـــێت، لەهەمان کاتیشدا هاوشـــێوەی نییە لە وێرانکردنی تەندرووستیو ژیانیدا، هەروەها بێوێنەیە لە درووســـتکردنی ئالودەبوون، زەهرێکی کوشندەو زیانگەلێکی کۆمەڵایەتیی مەترسیدارە).

ســـەرچاوەکان کۆکن لەســـەرئەوەی، نیوەی تاوانەکانی بەریتانیا، کەسانی سەرخۆش پێیهەڵدەستنو سێیەکی ڕووداوەکانی هاتوچۆ، بەهۆی خواردنەوەوە ڕوو دەدات، ســـێیەکی ڕووداوەکانـــی خۆکوشـــتنو پێنجیەکـــی دەســـتدرێژیی سێکســـی بۆ منداڵان بەهۆی خواردنەوەوەیە. هەروەك ئاماژەش دەکەن بەوەی یـــەك لە چواری پیـــاوانو یەك لـــە دەی ئافرەتانێك کە مـــاددە کهوولییەکان دەخۆنـــەوە، ئەوەندە دەخۆنەوە لە ئەنجامـــدا خێزانەکەیان، یا کارەکەیان، یا تەندرووستییان، یان هاوڕێکانیان لەدەست دەدەن.

یەکەم شـــت کە لەفرمانەکانی مێشك لەدەست دەدرێت بەهۆی کهوولەوە، بریتییـــە لـــە لاوازبوونـــی توانـــای کۆنترۆڵکردنو زاڵبوون بەســـەر هەســـت، لەدەستدانی تەرکیز، هەروەها وردە وردە چالاکیی مێشكو جەستە دادەبەزێت هەرچەنـــدە بـــڕی کهوولەکە کەمیش بێـــت! هەروەها ئـــەو وێرانکارییەی لە شانەکانی لەشدا ڕوو دەدات، لە ئەنجامی خواردنەوەی تەنها جارێك ئەلکهوول، ڕەنگـــە ببێت بە وێرانبوونێکی هەتاهەتایـــیو جارێکی دیکە چاك نەبێتەوە!..

بۆیە جێی سەرســـامیی نییە، پەیامی پیرۆزی ئیســـلام، خواردنەوەی کهوولی قەدەغە کردووە، هەرچەندە بڕەکەشی کەم بێت.

لـــە ڕاســـتیدا ئەلکهوول تەنهـــا ژەهرە کە ڕێگـــەی پێدراوە لـــە جیهاندا بازرگانیـــی پێوەبکرێـــت، لەهـــەر جێگەیەك بتەوێت زۆر بەئاســـانی دەســـت دەکەوێـــت، ئـــەو کەســـانەی دەروونیان ئائارامـــە، هانای بۆ دەبـــەن، وەلێ لە کۆتاییدا تووشی تێکچوونی تەواوی کەسێتی دەبنو دەروونیان وێران دەبێت بە نەخۆشیی(Psycho-pathic Anomaly). تەنها پێکێك خواردنەوە ڕەنگە ببێـــت بەهۆی ژەهراوییبـــوون، ماخۆلانو تەممەڵی، هـــەروەك دەبێت بەهۆی مەســـتییو ئاگالەخۆنەمـــان، بەڵام ئەوانـــەی بەردەوام دەخۆنەوە، ســـەرەنجام هەموو ڕەوشتە باڵاکان لەدەست دەدەنو دەبن بە کەسانێکی نەخوازراو.

**٢- ئایا کەمێك خواردنەوەی کهوولی سوودبەخشە؟**

لەنێـــو پزیشـــکانو خەڵکانـــی ڕۆژئـــاوادا، بیرۆکەیـــەك هەیـــە دەڵێـــت: خواردنـــەوەی کەمێـــك کهوول، ڕێـــژەی مردن بە جەڵدەی دڵ کـــەم دەکاتەوە، لەبەرئەوەی بڕی کۆلیسترۆڵی بەسوود (HDL) زیاد دەکات.

توێـــژەرە یابانییەکان بۆیان دەرکەوتووە، ئـــەو ماددەیەی بڕی (HDL) بەرز دەکاتەوە، لە بنچینەدا لە توێکڵی ترێی ســـووردا هەیە، پێی دەگوترێت: (Resveratrol). کەوابێت: بۆچی خۆمان بخەینە بەر زیانەکانی کهوول، لە کاتێکدا هەمان سوود لە ترێی سروشتییدا هەیە؟!

هەر ئەمەش نا، خواردنەوەی کهوول، ڕێگە خۆش دەکات بۆ جەڵتەی دڵ، لەو کەسانەدا کە خوێنبەرەکانی دڵیان تەسکبووەتەوە، هەروەها دەبێت بەهۆی ســـنگەکوژێو *تێکچوونی لێدانی دڵو تێکچوونی ماسولکەکانی دڵ، لە ئەنجامدا* مردنی لەناکاو.

زۆربەی مردنو پشـــێوییەکان، لەو کەســـانەدا ڕوو دەدات، کەپێیان وایە کەم دەخۆنەوەو بڕێکی وا نییە، یان ئەوانەی پزیشکان ڕێیان پێ دەدەنو گوایە بڕێکی دیاریکراو زیانی نییە!

**٣- کاریگەرییە گشتییەکانی ئەلکهول لەسەر تەندرووستیی:**

لە ڕووی زیانە تەندرووســـتییەکانەوە، سانتیمەترێك لەجەستە نامێنێت زیانی ئەم ژەهرەی پێ نەگاتو کاریگەرییەکانی بەسەر جەستەوە بەم قۆناغە یەك بەدوای یەکانەدا دەڕوات:

* **دڵخۆشـــییەکی لەڕادەبەدەر (Euphoria):** بەجۆرێك کەسەکە هەست بە متمانەبەخۆبوونو ئازایەتیی دەکاتو توانای بڕیاردانی دەگۆڕێت.

* **قۆناغی وروووژان (Excitement):** تێیدا کەســـەکە هەســـت بەکێشە دەکات لە تێگەیشـــتنو بیرهاتنەوەدا، جموجووڵی ناهاوســـەنگی لێ دەبینرێت، بینینی تێك دەچێتو باوێشکی زۆر دەبێت.

* **قۆناغی پشـــێوی (Confusion):** دەبینیت توندووتیژەو گۆشەگیرەو هەست بەئازار ناکات (وا دەزانێت بووە بە سۆپەرمان).

* **قۆناغـــی وڕبوون (Stupor):** کەســـەکە بەزەحمەت دەجووڵێت، وەك ئەوەیـــە کاردانـــەوەی نەمابێـــت، لەنێوان هـــۆشو بێهۆشـــییدایەو دەناڵێنێت بەدەست ڕشانەوەیەکی بەهێزەوە.

* **قۆناغی لەهۆشـــخۆچوونی تەواو (Coma):** کە بە دوای خۆیدا مردن دەهێنێت، گەر بەردەوام بێت لە خواردنەوە.

بە ویســـتی خودا، لەژمـــارەی داهاتوودا باســـی کاریگەرییەکانی بەســـەر هەریەك لە کۆئەندامەکانی جەستەوە دەکەین.



# سوودەکانی مۆز

مۆز یەکێکە لە میوە بەسوودەکان، لەهەمان کاتیشدا تامی خۆشە، سەرەتای سەرهەڵدانی مۆز بۆ مالیزیا دەگەڕێتەوە، پاشان لە سەدەی شەشەمی زاینیدا، مالیزییەکان بۆ هیندستانیان بردووە، دواتر بە چینو زۆربەی ناوچەکانی دیکەی جیهان گەیشتووە.

مۆز چەند ڕەنگێکی هەیە لەوانە زەردو سوورو ئەرخەوانیو سەوز، زۆربەی بەها خۆراکییەکانی تێدایە لەوانە:

* ڤیتامین (C، B6).
* پۆتاسیۆمو ئاسنو ڕیشاڵی تێدایە.
* سۆدیۆمو چەوریو کۆلیسترۆڵی کەم تێدایە.
* سێ جۆر شەکری سرووشتی تێدایە، کە سوکەرۆزو فرەکتۆزو گلوکۆزن.

**سوودەکانی مۆز بۆ جەستە:**

**١- گەدە:** یەکێك لە سوودەکانی مۆز بۆ لەش، بەکارهێنانییەتی وەك چارەسەرێکی چالاك بۆ تێکچوونەکانی ڕیخۆڵە بەهۆی نەرمییەکەیەوە. بە یەکەم میوە دادەنرێت، کە نابێت بەهۆی هیچ کێشەیەك، ئەگەر کەسێ برینی گەدەی درێژخایەنی هەبێت، ئازارو پێچی گەدە کەم دەکاتەوە، هەروەها زۆر بەسوودە لە چارەسەری هەوکردنی کۆڵۆنو قەبزیو سکچوون، بەهۆی بوونی کاربۆهیدراتێك کە لە هیچ میوەیەکی دیکەدا نییەو بەئاسانیش هەرس دەبێت.

**٢- وەرزشەوانان:** لەبەرئەوەی مۆز بڕێکی باش لە ڤیتامینو کانزاکانی تێدایە، بە سەرچاوەی وزەی سرووشتی دادەنرێت، بە تەنها خواردنی دوو مۆز ڕۆژانە، بەسە بۆ پێدانی وزەی تەواو بۆ کارکردنو ڕاهێنانکردن بۆ ماوەی یەك کاتژمێرو نیو، هەروەها لەوانەیە خواردنی مۆز لە ڕۆژدا، یارمەتیی چالاکبوونی لەش بدات لە بری خواردنەوەی چا، یان قاوە، یان خواردنەوە گازییە زیانبەخشەکان، بۆیە بە باشترین خۆراك دادەنرێت بۆ ئەوانەی وەرزشی لەشجوانی دەکەن؛ چونکە بۆ ماوەیەکی زۆر وزە بە لەش دەبەخشێت.

**٣- تەندرووستیی دڵ:** بەهۆی دەوڵەمەندیی ئاستەکانی پۆتاسیۆم لە خوێندا، یارمەتیی هاوسەنگی لێدانەکانی دڵ دەدات، لەڕێی ناردنی ئۆکسجینی پێویست بۆ مێشك.

**٤- کەمخوێنی:** ڕێژەیەکی زۆربەرز توخمی ئاسنی تێدایە، هانی بەرهەمهێنانی هیمۆگلۆبینی خوێن دەدات، ئەمەش یارمەتیی چارەسەری کەمخوێنی دەدات.

**٥- وازهێنان لە جگەرەکێشان:** جگەرەکێشان خوویەکی خراپەو کاریگەریی خراپی لەسەر تەندرووستیی جگەرەکێش هەیە، ئەوەی دەبێت بە ڕێگر لە ڕێگەی وازهێنانی جگەرە لای هەندێ کەس، کێشەی ڕاکێشانو دەرهێنانی نیکۆتینی ناو خوێن، بەڵام بەهۆی بوونی ڤیتامین B12و B6و پۆتاسیۆمو مەگنیسیۆم لە مۆزدا، یارمەتیی لەش دەدات لە ڕزگاربوونی لەو کاریگەرییانەی لە ئەنجامی ڕاکێشانی نیکۆتینی خوێن دروست دەبێت.

**٦- کێش دابەزاندن:** مۆز بە سستمێکی باش دادەنرێت لە لاوازکردندا، بە بەکارهێنانی مۆز لەگەڵ ماستی بێچەوریدا خواردنی پێکەوە دەبێت بەهۆی لاوازکردنو دابەزینی کێش.

خواردنی شەش دانە مۆز لەگەڵ چوار کوپ ماست، کە چەور نەبێت، ڕۆژانە بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ، پاش ئەوە دەتوانرێت، مۆزەکە بگۆڕیت بۆ سەوزە.

**٧- کێشەکانی سووڕی مانگانە:** خواردنی مۆزی لێنراو لەگەڵ ماستدا، چارەسەرێکی چالاکە بۆ ئەوانەی کێشەی سووڕی مانگانەیان هەیەو تووشی خوێن بەربوون دەبن، هەروەها یارمەتیی زۆربوونی هۆرمۆنی پرۆجیسترۆن دەدات.

**٨- یادەوەریو خەمۆکی:** مۆز تریبتۆفانی "کە جۆرێکە لە پرۆتین" تێدایە، ئەم پرۆتینە لەش بۆ هۆرمۆنی سیرتۆنین دەگۆڕێت کار دەکات بۆ هەست بە خۆشیکردنو باشبوونی مەزاج، بەجۆرێك خواردنی مۆز، وات لێ دەکات بیر لە خواردنی هێورکەرەوە نەکەیتەوە، هەروەها بوونی ڤیتامین B6 بە ڕێژەیەکی باش، ئاستی شەکر لە خوێندا ڕێك دەخات، ئەوەش یارمەتیی باشکردنی مەزاج دەدات.

**٩- جوانیو تەندرووستی قژ:** مۆز تەنها سوودی بۆ لەش نییە، بەڵکو بۆ قژیش بەسوودە، بەهۆی دەوڵەمەندیی مۆز بە پۆتاسیۆمو کاربۆهیدراتو ڤیتامینو زەیتەکان، ئەمانەش یارمەتیدەرن بۆ نەرمکردنو پاراستنی قژ لە وشکبوونەوەو جوانیو ڕەونەقو بریسکەی پێ دەبەخشێت، هەروەها یارمەتیی پاراستنی قژ دەدات لە زیانەکانی پیسبوونی ژینگەو ڕێگرە لە گەشەی کرێش.

**١٠- پێست:** بەهۆی بوونی ژمارەیەك لە توخمە خۆراکییە گرنگو پێویستەکان لە مۆزدا، وەك ڤیتامین سیو ئەیو B6و B12و پۆتاسیۆمو مەگنیسیۆم، ئەم توخمانە یارمەتیی ڕوونیو باشکردنو جوانکردنی پێست دەدەن. دەتوانرێت ماسکی تایبەت لە مۆز دروووست بکرێت بۆ پاراستنی پێست لە وشکبوونەوەو لابردنی خانەی مردووەکانی پێستو پارێزگاری لە چرچولۆچبوونی پێستو ڕزگاربوون لە سووتاوی پێست بەهۆی تیشکی خۆرەوە، ماسکەکەش بەم شێوەیە دروووست دەکرێت: مۆزێکی شێلراو یەك کەوچك هەنگوینی بۆ زیاد بکەو جوان تێکیان بدە، پاشان ئەم پێکهاتەیە بدە لەپێستی دەمو چاوو مل، بەبێئەوەی بەرچاو بکەوێت، بۆ ماوەی ١٥ خولەك، پاشان بە ئاوێکی شلەتێن بشۆردرێت.

**١١- ئافرەتی دووگیان:** خواردنی مۆز، بۆ ئافرەتی دووگیان زۆر بەسوودە؛ بەهۆی بوونی هەموو بەها خۆراکیو ڤیتامینو توخمە خۆراکییە گرنگو بەسوودەکان تێیدا، سەرەڕای بەسوودی بۆ کۆرپەلە.

www.livestrong.com- www.babycenter.com

www.parentingweekly.com-www.medicalnewstoday.com



# بەدوای دەرفەتدا بگەڕێن



و: ئاسیا صەلاح

مـــرۆڤ هەمیشـــە باس لە وشـــەی دەرفەت دەكات وەك ئەمـــڕۆ دەیبینین، ئەمـــەش واتـــای زۆری دەرفـــەتو زۆری بایەخپێدەرانـــی دەگەیەنێـــت. خودای گەورە گۆڕانكاری لە بوارەكانی ژیانو شـــێوازی ئەو گۆڕانكارییانەی كە بەســـەر بارودۆخەكانی مرۆڤدا دێت، كردووە بە هۆكارێك بۆ فەراهەمكردنی هەلو توانا، كە مرۆڤ بتوانێت لێی سوودمەند بێت، لەبەرئەوە داوا لە كچو كوڕەكانم دەكەم، مادام ژیان بوونی هەیە، بێگومان هەلی كاركردنو خۆشـــبەختیو ســـەركەوتنو بەخشـــندەییو بەرەوپێشچوونیش بوونی هەیە، بەڵام دەبێت بڵێین: دەرفەتەكان وەك ماســـی وان، هەڵە بچووكو كەمنرخەكان هاوشـــێوەی ماسییە بچووكەكانن كـــە لـــە نزیك كەنار دەریاكان لـــە تەنكاییدا دەبینرێن، بـــەڵام هەلە مەزنەكان هاوشـــێوەی ماســـییە گەورەكانو مروارین، كە دەبێت بچنە ناوقووڵاییو ڕۆخی دەریـــاوە. هەرگیـــز دەرفەت نادات لە دەرگای كەس مەگـــەر زۆر تایبەتو ناودار بێت، بـــەڵام گەنجانو تازەدەرچووان دەبێت بەدوای هەلدا بگەڕێن بەجدیو بە ڕێگای خۆی.

هەندێـــك لـــە كوڕو كچەكانم چەنـــد ڕۆژێك بـــەدوای كاردا دەگەڕێن، گەر دەستیان نەكەوت، دادەنیشن، دەیخەنە پاڵ بەختیانو تاوانباری دەكەن، سكاڵا لە خراپیی بارودۆخەكان دەكەن، ئەمەش شتێكی باش نییە. خەڵكانێك هەن پێویستیان بـــە خـــۆتو شـــارەزاییو بوارەكەت هەیە، چەنـــد زانكۆ هەن كە خۆشـــحاڵ دەبن بە خوێندنی تۆ لەوێ، چەندان پرۆژە هەن، كە دەتوانیت بەســـەركەوتوویی ئەنجامیان بدەیت، بەڵام بەدواگەڕانی بێهیوایانە، ڕەنگە نەتگەیەنێتە هیچ كام لەمانە.

**ئەمەش چەند تێبینییەك لەسەر بابەتی دەرفەت:**

١- دەرفـــەت هەبوون بەخششـــی خودایە، كە هەر بـــە گوێڕایەڵیی ئەویش بەدەســـت دێن، بۆیە زانســـتخواز، دەبێت ترسی خودای لە دڵدا بێتو خۆگربێت لەســـەر فەرمانەكانی، خودای گـــەورە دەفەرموێـــت: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ ۚ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾﴾ الطلاق

(واتە: هەركەس لە خودا بترســـێت، خـــودا كەلێنێكی بۆ دەكاتەوە ڕزگاری ببێت پێی لە تەنگوچەڵەمە، ڕۆزیشی لە لایەكەوە بۆ دەنێرێت، كە خۆی گومانی نەبردبێت، هەركەســـیش پشـــت بە خودا ببەستێت، خودای بەسەو پێویستی بە كەســـی دی نییە، خودا كاری خـــۆی دەگەیەنێتە هەر ڕادەیەك، كە خۆی مەیلی لێ بێت، خودای گەورە بۆ هەر شتێك ئەندازەیەكی داناوە).

پەیوەندیـــی باش لەگەڵ خەڵكیو خزمەتكردنیـــانو نەرمونیانی لەگەڵیاندا، لـــەو كردەوانەن كە خـــودا پێی ڕەزامەندنو ســـەرچاوەی ڕزقو ڕۆزییە؛ چەندان نموونە هەن لەســـەر ئەمە كە ئەژمار ناكرێنو لاســـاریو تەنهاییو خۆپەرســـتی، دژەكاریگـــەری هەیـــەو قڕ دەخاتە ناو دەرفەتەكانەوە، چەندان ڕاســـتیش پشـــت ڕاستی ئەمە دەكەنەوە.

بەخشـــین دەرگایەكە بۆ ڕزقی خودا؛ بەساڵاچوویەك بە نەوەكانی دەڵێت: ئەگەر خەمەكان سەختتر بوون، بارودۆخەكان قورستر بوون، ببەخشن گەرچی كەمیش بێت، خودا ئەوەی بەخشـــیوتانە قەرەبووی دەكاتەوە بۆتان بە چەند قـــات. چاكە لەگەڵ دایكو باوكتانو ســـیلەی ڕەحمتان لەبیر نەچێت، ئەوانیش ســـەرچاوەن بۆ ڕزقی خودا، پێشەوامان (درוودی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: "هەر كەس دەیەوێت ڕزقی فراوان بێت، تەمەنی پڕ بەرەكەت بێت، با ســـیلەی ڕەحم بگەیەنێت".

٢- دەرفـــەت بوونـــی هەیەو بوونیشـــی نییە لە هەمان كاتـــدا، بوونی هەیە لەبەرامبەر كەسانی شیاودا، بەڵام بوونی نییە لەبەرامبەر تەممەڵانو كەمتەرخەمو نارێكاندا، بۆیە هیوادارم لە ژیانتان بەپێی ئەم یاسایە بڕۆن بەرێوە:

مرۆڤ تا زیاتر بەهێزو ئامادەو لێهاتوو بێت؛ زیاتر پێویســـتییان پێی دەبێت، زیاتر بەدووی دەگەڕێن؛ "مرۆڤ تا زیاتر لاواز بێت لە تواناو ئامادەییو بەهرەكانیدا؛ زیاتر پێویستی بە خەڵكی دەبێت، ئەوانیش خۆیانی لێ بەدوور دەگرن". ئەمەش وەك خوێندكارێك وایە، كە نمرەی كۆتایی ساڵی ئامادەیی وەردەگرێتو دەردەچێت لـــە تاقیكردنەوەی زانكۆدا، دەبینێـــت دەرگای هەموو كۆلێژەكان بەڕوویدا كراوەیە. خوێندكارێكیتریـــش لە زانكۆیەكی زۆر باش تەواوی دەكاتو گرێبەســـتی كاركردن تەنانەت پێش دەرچوونی وەردەگرێت، ئەمە شتێكی زۆر ڕوونە.

٣- گەر یەكێكتان سەرپشـــك كرا لەنێـــوان هەڵبژاردنی ئەوەی ئایا لە ماڵی خـــۆی دابنیشـــێت، یاخـــود بە بێ بەرامبـــەر كارێك بكات، با بە بـــێ بەرامبەر كاركردنەكـــە هەڵبژێرێت؛ چونكە كارەكە خۆی لە خۆیدا دەبێت بە كارێكی بە بەرامبەر بە ناسینی خاوەن كارەكانو بەدەستهێنانی ئەزموونی زیاتر...

٤- هەمیشـــە هـــەوڵ بـــدە تایبەتمەندیت هەبێت لەچـــاو نزیكانتدا، وەك زانینی زمانی بیانی، شارەزایی لە بواری كۆمپیوتەردا، بوون بە خاوەنی پسپۆڕی لە یەكێك لە بوارەكانی زانســـتدا، یان لە شتێكی پیشەییو تەكنیكیدا، یاخود با بڕوانامەیەكی بەرزت هەبێت.

٥- گەر كاری شایستەت نەدۆزیەوە، لە ماڵەوە قەتیس مەبە، ئەوە قبوڵ بكە كە هاتۆتە ڕێگەتو ئەوجا بەدوای كارێك بگەڕێ كە لەگەڵت دەگونجێتو باشە.

٦- هەوڵ بدە فێر ببیت، چۆن لەبارەی خۆتەوە، زانیاری دەدەیت لەڕێگەی نووســـینی كورتەی ژیاننامە بەشێوازێكی باش، یاخود لە سایەی ئامادەكاری بۆ چاوپێكەوتنـــی كارێك، هەروەها دەتوانیت لە ڕێگەی پێشكەشـــكردنی كاری زۆر ناوازەوە لە ماوەی ئەزموونیدا پێش گرێبەستەكە.

٧- شـــتێكی ئاساییە، كەســـەكە لە ناوەندی تەمەنیدا، هێشـــتا خاوەن كارێك نەبێت، دوای چوار، یان پێنج ساڵێك، شتەكان باش دەبنو كێشەكەش بەكۆتا دێت.

و: چیمەن لەتیف



# لەکۆتاییدا... سەرکەوتین

سەرەڕای تێپەڕبوونی چەند دەیەیەك، دەتوانم ئەو دیمەنە وەبیر بێنمەوە.. ئەوکات تەمەنم تەنها پێنج ساڵان بوو، لە نێوان چەندین بارتەقای کتاودا، دەهاتمو دەچووم، زۆربەیان باپیری کۆچکردووم (خودا لێی خۆشبێت) شێخ ئەبی هیلالی شازلی بۆ باوکمی بەجێهێشتبوو.

بانخانووەکەمان بە چەندین بەرگو کتێب پڕ کرابوو، بەرلەوەی ماڵمان بەجێ بهێڵێت، میراتی بەخێوکەرەکەمان (لەلەکەمان) بوو، ئەو کات گرنگی ئەو کۆمەڵە پەڕانەم نەدەزانی، بەخاتری هۆکارێك تا ئێستاش نازانم چییە، ئەو پەڕانەم خۆش دەویست!

ڕۆژێك لە باخچەی ماڵەوەدا دانشتبووین، دەنگی نەنکم بەرگوێمان کەوت، هەڵوێستەیەکمان کردو گوێمان بۆ هەڵخست، ئەمری بەجێ بوو، بەکورتی دەبێت سەربانەکە لەو خاشاکانە پاك بکرێتەوە، مریشکی لێ بەخێودەکات!

چەند ڕۆژێ دواتر فەرمانەکە جێبەجێ کرا، شاڵاوی ئاور وەحەوادا دەچوو، تا تەمەنم بوو بە سیازدە ساڵان، نەمتوانی لە دڵرەقیی ئەو دیمەنە بگەم.

خوێندکارێك بووم لە خوێندندا بەربەرستی زۆرم بۆ دروست دەبوو، ئەو کات حەزی خوێندنەوەو نووسینم لادرووست بوو بوو، دەبوو بەرامبەر ئەو بارودۆخە، بڕیارێکی بوێرانە بدەم؛ تا زیاتر گرنگی بە خوێندن بدەم.

بڕیارەکە حازر بەدەست بوو. گشت پەرتووکەکانم کۆکرانەوەو بەدەنکە شقارتەیەك ئاگردران، جارێکی دی لە ماڵی شێخ هیلالدا بڵێسەی ئاگر بەرزبووەوە تێپەڕبوونی ڕۆژگار. تائێستاش ئەو دیمەنەی لە بەرچاوم کاڵ نەکردۆتەوە.

خۆشەویستیم بۆ ئەو ئازیزە دووردەستە، زیادی دەکرد، هاوکات دەبوو قوربانی زێتر بدەم. تا ئێستاش وا دەزانم دوێنێیە، کتاوەکانم وەبن هەنگڵم دەناو لە کارێکەوە دەمگواستەوە بۆ کارێکی دیکە، خەڵك بە چاوی کەمایەسیەوە سەیریان دەکردم، زمانی حاڵیان دەیگوت: لە مێژە دەوورانی فەیلەسوفان بەسەر چووە!

کاتێك هاوەڵێك لە هاوەڵانی خانەوادەکەم گوتی: ڕاستە دەرێن حەزت وەخوێندنەوەیە؟ لە وەڵامدا گوتم: ژیانم خوێندنەوەیە، خواردنو خواردنەوەم لە خانەی ئارەزووەکانمدا ڕیز دەکەم، بەڵام خوێندنەوە پێویستیەکی زیندەگیمە.

هەناسەدان هۆکاری مانەوەمە لە ژیاندا، بەڵام خوێندنەوە پاساوێکە بۆ مانەوەم. گەورەبووم، گەورەبوومو سۆزوخۆشەویستیم لەگەڵ خوێندنەوەدا گەورەبوو.

ئێستا من لە دەیەی سێیەمی تەمەنمدام (نووسەر)، وەك حاڵی گشت خۆشەویستێك... دادەنیشمو تەواشا دەکەم، خانەیەکی بڵاوکردنەوەی کتێبم پێك هێناوە، هاوکات یارمەتیدەرم بووە لە بڵاوکردنەوەی پەرتووك لە وڵاتانی ئارەویدا، بەو هۆیەوە منیش بەشدارم لە دروستکردنی هزر دەناو ئارەباندا. کاتێك یادگەم بۆ دواوەو دەگەڕێنمەوەو شاڵاوی ئاگری کتێبەکانم دەپێش چاو دەخەم، زەردەخەنەیەك دەمگرێت، لە کتێبخانە گەورەکەم دەڕوانمو بەنازەوە پێی دەڵێم: لە کۆتاییدا سەرکەوتین.



هەڵسەنگاندن

## مانگی ١١

# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت..

لــەم ژمارەیەدا، باس لە ســیفەتو هەڵســوکەوتو ئاکاری ئەو کەســانە دەکەین، کە لە مانگی یانزەدا لەدایکبوون، جا ئەگەر تۆی خوێنــەر لە مانگــی یانزەدا چاوت بــە ژیان هەڵهێنــاوەو هاوکات زۆرینــەی ســیفەتە ئەرێنییەکان، کە لــەم بابەتەدا بــاس کراوە، یەك دەگرێتەوە لەگەڵ هەڵســوکەوتو ڕەوشــتو ئــاکاری تۆ، ئەوا هەوڵ بدە، لەســەر ئەو خاڵە ئەرێنیانە بمێنیتەوەو کۆششی زیاتر بکە؛ بۆئەوەی زیاتر گەشــەیان پێ بدەیت، لە هەمان کاتدا ئەگەر ســیفەتو هەڵســوکەوتو ئاکاری تۆ یەك دەگرێتــەوە لەگەڵ خاڵە نەرێنییەکانــدا، ئــەوا هەوڵ بدە ڕیشەکێشــیان بکەیتو خۆت لەو سیفەتانە دابڕنیت، هاوکات لەجێی ئەو سیفەتانە، سیفەتی ئەرێنی لە شوێنیاندا بڕوێنە:

**سیفەتە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی ١١دا لەدایکبوون:**

١- بەشێوەیەکی گشتی خاوەن بیرۆکەو بیری نوێن.

٢- کەسانێکی دووربینو زیرەكو لێهاتوون!

٣- خاوەنی پێشبینییەکی وردو بەهێزن.

٤- ئەگــەر هــەوڵ بدەنو تێ بکۆشــنو خۆیان مانــدوو بکەن، دەگونجێت ببن بە پزیشکێکی لێهاتوو.

٥- کەسانێکی هۆشیارنو بە وریاییەوە مامەڵە دەکەن.

٦- کەسانێکی بزێونو حەز بە جووڵەو گەڕان دەکەن.

٧- نهێنیپارێزن، ئارامگرنو هەمیشە بیر دەکەنەوە.

٨- دەزانن چۆنو لە چ کاتێکدا نهێنییەکانیان ئاشکرا بکەن.

٩- کەسانێکی هێمنو ئازاو بەخشندەن.

١٠- هەمیشە درووشمیان بریتییە لەوەی کە هیچ شتێك قورس نییە، ئەگەر مرۆڤ ویستو ئیرادەی هەبێت.

١١- دیزاینــەری ئامانجەکانیانن، واتە: دەزانن چۆن نەخشــەی ئامانجەکانیان بکێشن.

١٢- زۆر بە گران تووڕە دەبن، تەنها مەگەر کەسانێك بیانەوێت گاڵتە بە هەستو سۆزیان بکەن.

١٣- جیاواز لە کەسانی دی بیر دەکەنەوە.

١٤- خاوەن ڕوحیەتێکی بەرزو جەستەیەکی پتەوو دارڕژاون.

١٥- توانای هاندانی خودیان هەیە.

١٦- کەســانێکی خۆشەویســتو لەبەردڵانــن، زۆر دڵســۆزن بۆ کەســانێك کە خۆشــیان دەوێــن، پەلەش ناکەن لــە دەربڕینی خۆشەویستی بۆ بەرامبەر.

١٧- حەز بە پێداهەڵدانو ستایشکردن ناکەن.

**سیفەتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی ١١دا لەدایکبوون:**

١- زۆر بەقورسی لە کەسانی بەرامبەر تێدەگەن.

٢- بیرۆکەکانیان ئاسایی نین.

٣- کەسانێکی فزوولین!

٤- کەمدوون، واتە: کەم قسە دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە خاوەن هاوڕێو برادەرن.

٥- کەللەڕەقو دڵڕەقن.

٦- هەرگیز تەســلیم نابن، واتە: ئینکارن لەســەر ڕای خۆیانو هەر خۆیان بەڕاست دەزانن.

٧- زۆربەی کات، حەز دەکەن تەنها بن.

خوێنەری ئازیز: گەر ســەرنج بدەین دەبینین خاوەنی حەڤدە خاڵــی ئەرێنیــن، بەرامبــەر بە حــەوت خاڵی نەرێنــی، بێگومان هەوڵدانو تێکۆشان، ویســتو ئیرادە دەتوانێت نەرێنییەکان بنەبڕ بکاتو گەشــەی زیاتــر بە خاڵە ئەرێنییەکان بــدات. بەو هیوایەی بتوانین هەمیشە هەوڵی خۆڕازاندنەوە بدەین بە خاڵە ئەرێنییەکان.




# بیرتیژی و وەڵامە بەهێزەکانی هەیاس

ناوبانگی زیرەکیو لێهاتوویی هەیاسی خاس، شاری پڕ کردبوو، تەنانەت وای لێهاتبوو، وەکوو نموونە، زیرەکییەکەی باس دەکرا.

خاوەنــی فیراســەتو زیرەکییەکی بێ وێنە بــوو، بیری تیژو وەڵامی بەهێزو فیراسەتەکەی هەموانی سەرسام کردبوو، لە بابەتی ئەم ژمارەیەدا، باس لە فیراســەتو وەڵامــە بەهێزەکانی دەکەین..

دەگێڕنەوە: جارێکیان هەیاسی خاس، لە نێو هاوەڵانیدا دانیشتبوو، ســەرنجیدا پیاوێك لەســەر ســەکۆی حانووتەکە دانیشــتبوو، هەر کەســێك بەلایــدا تێدەپــەڕی ئاوڕی بــۆ دەدایەوەو بــە دیقەتەوە ســەرنجی دەدا، پاشــان هەیاس هەڵساو ســەیرێکی ڕوخساری ئەو پیاوەی کرد، دواتر گەڕایەوەو بە هاوڕێکانی گوت: من وا دەزانم ئەو پیــاوە فەقیهەو خزمەتکارێکی کوێری هەیە، بەڵام خزمەتکارەکەی ڕای کردووە، ئێســتا لەو شوێنەدا دانیشــتووەو بەدوایدا دەگەڕێت، هاوەڵانی بە بیســتنی ئەم قســەیە تەواو سەرســام بــوون؛ چونکە هەیــاس لەوەو پێش ئــەو پیاوەی نەدیتبوو، لەبەرئەوە هەڵســانو ڕۆیشتن لە کابرایان پرسی:

کابرا هەمان ئەو وەڵامەی دایەوە، کە هەیاس گوتبووی!

پاشــان گەڕانەوە بۆ لای هەیاسو پێیان گــوت: جەنابی قازی، چــۆن ئــەوەت زانی؟ هەیاس گوتی: لەبەرئەوەی لەســەر ســەکۆی حانووتەکە دانیشــتبوو، زانیــم ئەو کابرایە خاوەنــی پلەوپایەیە، پاشان کە سەرنجم دا، هەستم کرد کە ئەو پیاوە فەقیهەو زانستو زانیــاری لە نێوچەوانی دەخوێنرێتەوە، کاتێکیش بینیم ســەرنجی هەمــوو کەس دەدات کــە بەلایدا تێدەپەڕێت، ســەیری دەکاتو بە وردی سەرنجی دەدات، زانیم کە خزمەتکارەکەی ون کردووە، پاشان هەســتاو ســەیرم کرد دەڕوانێــت بۆ لایەکی ڕوخســاری هەر یەك لەوانــەی بە لایدا تێدەپەڕن، بەوەش زانیــم کە ئەو خزمەتکارەی ونی کردووە چاوێکی کوێرە!

**خاڵێکی دیکە لە ســیمای زیرەکیی هەیاس وەڵامە بەهێزەکانی بوو:**

جارێکیان کابرایەکی دەشــتەکی، هاتە لای هەیاسی خاسو لێی پرسی: جەنابی قازی ئەگەر خورما بخۆم، ئایا جەڵدم لێدەدەیت؟

هەیاسی خاس گوتی: نەخێر!

پاشان کابرا گوتی: باشە ئاو بخۆمەوە جەڵدم لێدەدەیت؟

دووبارە قازی، بە نەخێر وەڵامی دایەوە!

کابرا گوتی: باشــە خواردنەوەی مەی کــە هەر لە ئاوو خورما پێکهاتــووە، ئیدی بۆچی حەرامەو هەر کــەس بیخواتەوە، جەڵدی لێ دەدەیت؟!

هەیاســی خاس ڕووی لە کابرای دەشــتەکی کردو گوتی: ئەگەر کەمێك گڵ بکەم بە سەرتدا، ئازارت دەگات.

دەشتەکییەکە گوتی: نەخێر..

قــازی هەیاس گوتی: ئەی ئەگەر کەمێك ئاو بکەم بەســەرتدا، ئایا سەرت دەشکێت؟

دەشتەکییەکە گوتی: نەخێر جەنابی قازی!

پاشان قازی هەیاس گوتی: ئەی ئەگەر هەمان ئاوو گڵ تێکەڵاو بکەمو خشتێکی لێ درووست بکەم، پاشان خشتەکە بدەم بەسەرتدا، ئەو کاتە چی ڕوو دەدات؟

کابرا گوتی: بێگومان سەرم دەشکێت!

هەیاس گوتی خواردنەوەی مەیو بادەش، بە هەمان شێوەیە!!

# وەڵامی بەجێ

* شەعبی دەڵێت: ڕۆژێکیان لای قازی شورەیح دانیشتبووم، ئافرەتێك بە گریانەوە هات بۆ لای قازیو سکاڵای لە هاوسەرەکەی کرد، گوتم بە قازی، خودا سەلامەتت بکات، ئەو ئافرەتە ستەملێکراوە، گوتی: چۆن دەزانیت؟

گوتم: بە گریانەکەی!

قازی گوتی: نا وا نییە، خۆ کە براکانی یوسف گەڕانەوە بۆ لای باوکیان، دەگریان بۆ یوسفی برایان، لە کاتێکدا ئەوان ستەمکار بوون، یوسفیان خستبووە ناو بیرو وەکوو کۆیلە فرۆشتبوویان!

* ڕۆژێك باڵووڵی حەکیم لە سەردانی گۆڕستان دەگەڕایەوە، پێیان گوت: لە کوێ بوویت؟

گوتی: لای کاروانێك بووم، کە پێش ئێمە ڕۆیشتوون؟

گوتیان: ئەوان چیان دەگوت؟

لە وەڵامدا گوتی: کاروانەکە گوتیان: ئێمە چاوەڕوانی ئێوەین، تا هەموان نەگەن، ئێمە ناڕۆین!

* لە نووسەری فەرەنسی (ئەندریە موروا)یان پرسی: بۆچی ئێستا تەڵاق بە بچووکترین هۆکار ڕوو دەدات؟ واتە: لە درووستبوونی بچووکترین کێشە لە نێوان ژنو مێرددا، تەڵاق دەکەوێتە نێوانیانەوە؟

لە وەڵامدا گوتی: چونکە ئێستا، لەبەر بچووکترین هۆکار، هاوسەرگیری ئەنجام دەدرێت!

* ئافرەتێکی قەڵەو سواری پاسێك دەبێت، یەکێك لە سەرنشینەکان دەڵێت: نەمدەزانی کە ئەم پاسە تایبەتە بە فیلەکان!

ئافرەتەکەش، بەهێمنی وەڵامی دایەوە: نەخێر قوربان، ئەم پاسە وەکوو کەشتییەکەی نوح وایە، فیلیشو گوێدرێژیش سەر دەکەون!





# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

مــەرج نییە ئەوەی بێتە ئەژمار گرنگ بێ، مەرجیش نییە ئەوەی گرنگ بێت، بتوانرێ ئەژمار بکرێ!

(ئەنیشتاین)

بەرەبەیان، ئاو، خۆر، مانگ، شەو، من ناچارنیم هیچ کام لەمانە بە پارە بکڕم!

(-تایتوس- شانۆنووس)

ئەگەر زیتر لە پێویست خەمەکانت شاردەوە، ئەوە چەند قات زیاد دەکەن!

(مولێر- نووسەر)

گرنــگ حەزکردن نییە لە ســەرکەوتن، هەموومان ئەو هەســتەمان هەیە، گرنگ خۆ ئامادەکردنو هەوڵدانە بۆ سەرکەوتن.

(بربرایانت- ڕاهێنەری وەرزشی)

ئەوەی چاوەڕێی کاسەی دراوسێ بێ، بێ شێو سەر دەنێتەوە.

(پەندی کوردی)

هێندە ژیان بە قورس مەگرە؛ چونکە هەرچۆنێ بێت بەردەوام نابێت.

( واڵت کیلی -هونەرمەندی کاریکاتێر)



ئارام ڕەشید

# چیت هەیە، نەك چیت نییە!

عەتای کوڕی ئەبو ڕەباح، کەسێکی ڕەشپێست بوو، نابینا بوو، لووتی باریکو تەپیو بوو، شەل بوو، گۆج بوو، ئیبراهیمی حەربی دەڵێت: عەتا بەندەیەکی ڕەشپێست بوو، ڕوخسارێکی ناشیرنی هەبوو.

عەتای کوڕی ئەبو ئەرباح خاوەنی سەروەتو سامانو موڵکو سامان نەبوو، خاوەنی دەسەڵاتو پلەوپایە نەبوو، بەڵکو خاوەنی پێنج عەیبی سەرەکی بوو لە جەستەیدا (نابینا، شەل، گۆج، ڕەشپێست، ڕوخسارێکی ناشیرین)!

ئەگەر مرۆڤێك خاوەنی ئەم هەموو کەموکورتییە بێت، ئایا لە توانایدا هەیە، چ کارێك بکات؟ چۆن دەتوانێت ببێت بە کەسێکی ناودارو خاوەن پلەوپایە؟ ئایا دەستەوئەژنۆ دابنیشێتو ئەسرین هەڵبوەرێنێتو بۆ حاڵی خۆی ئاخ هەڵبکێشێت، ئایا بێهیوا بێتو چاوەڕوانی مەرگ بکات، ئایا عەتای کوڕی ئەبو ڕەباح بە خۆی گوت: من بەندەیەکم بەو حاڵەوە دەمێنمەوە، تا ئەو کاتەی ماڵاوایی لە ژیان دەکەم، من شەلو گۆجمو هیچ کەس من پەسەند ناکات، واتە کەس دانی خێرم پێدا نانێت! نەخێر، عەتا تەسلیمی ئەو بارودۆخە نەبوو، تەواوی ئەو بارودۆخە نەبووە ڕێگر بۆ بەدیهێنانی هیواو ئاواتەکانی، ورە پۆڵایینەکەی، نەك نەڕووخا، بەڵکو هەوڵی دا پتەوترو بەهێزتری بکات، بەپێچەوانەوە بە چاوێکی گەشبینانەوە بۆ خۆی ڕوانیو بە خۆی گوت: من خاوەنی دوو گوێچکەم کە پێیان دەبیستم، خاوەنی دووقاچم کە دەتوانم پێیان بڕۆم، خاوەنی زمانێکم دەتوانم قسەی پێ بکەم، دەستێکم هەیە دەتوانم پێی بنووسم، لە هەموو ئەمانەش گەورەتر خاوەنی عەقڵێکم، دەتوانم بیری پێ بکەمەوەو زانستو زانیاری پێ لەبەربکەم..

ئەمەیە لوتکەی گەشبینی، ئەوەیە نیشانەی مرۆڤی سەرکەوتوو، هێمای ورەیەکی بەرزو نموونەیەکی زیندوو، ئەو سەیری ئەو نیعمەتو بەخششانەی کرد کە هەیەتی، نەك ئەوانەی کە نییەتی؛ چونکە بنەمای هەموو گۆڕانێك، لە ناخی مرۆڤ خۆیەوە دەست پێ دەکات، عەتا بە خۆی گوت: گرنگ ئەوەیە کە من چۆن خۆم دەبینم، نەك خەڵکی چۆن من دەبینێت! ئەگەر تۆ خۆت وەکو کەسێکی بەهێزو زیرەكو لێهاتوو بینی، هەر بەو شێوەیەش دەردەکەویتو دەبیت، هەر بەو شێوەیەش خەڵکی مامەڵەت لەگەڵدا دەکەن!

دڵنیابە ئەگەر تۆ خۆت باوەڕت بە خۆت نەبێت، ئەوا هەموو دونیا ناتوانێت بە خەونو هیواو ئاواتەکانی خۆتت بگەیەنێت، بەڵام ئەگەر باوەڕت بە خۆت هەبوو، متمانەت بە تواناکانت هەبوو، دڵنیابە ئەوەی دەتەوێت بە پشتیوانی خودا بە دەستی دەهێنیت!

عەتای کوڕی ئەبو ڕەباح، بڕیاری دا بە دوای زانستو زانیاریدا بگەڕێتو بچێتە خزمەتی زانایانو فێری زانست ببێت، بڕیاری دا کە بە پشتیوانی خودای گەورە، دەبێت تواناکانی خۆی بسەلمێنێتو نیشانی خەڵکی بدات، کە عەتا شایەنی ژیانێکی باشترەو توانای گۆڕینی حاڵو بارودۆخو گوزەرانی خۆی هەیە. عەتا بەم دەستەواژە گەشبینانەوە، دەستی پێ کردو ڕووبەڕووی دەوروبەرو ژیان بووەوە!

باشە، ئێستا دەکرێت تۆی خوێنەر بپرسیت، ئەوانە تەنها قسەن، خۆ قسە ناچێتە گیرفانی کەس، کەواتە: لە کۆتاییدا چی ڕووی دا؟ ئایا ئەو بیرۆکە گەشبینانە هیچ سوودێکیان بە خاوەنەکەی گەیاند؟

با پێکەوە سەرەنجامەکەی بخوێنینەوە.. لە سەردەمی ئومەوییەکاندا لە شاری مەککەی پیرۆز، کە مەڵبەندی زانستو زانیاریو لانکەی سەدان زاناو کەڵەپیاوی لێهاتوو بوو، لە مەوسیمی حەجدا، پەیامێك ڕاگەیەنرا: (هیچ کەس فەتوا بۆ خەڵکی نادات، جگە لە عەتای کوڕی ئەبو ڕەباح)!

دەزانن ئەم دەستەواژەیە یانی چی؟

واتە هیچ کەس لە عەتای کوڕی ئەبو ڕەباح زیرەکترو زاناتر نییە!

زانایەکی وەکو پێشەوا ئەبو حەنیفە لەبارەیەوە دەڵێت: هیچ کەسم نەدیوە لە عەتا باشتر بێت!

عەتا بوو بە زانایەکی گەورەو پایەبەرزی سەردەمی خۆی!

گەشبین بە، ئەوەی دەتەوێت بەدەستی دەهێنیت، ئەمە چیرۆکی ئەو کەسە بوو، کە ٣٠ ساڵ لە شاری مەککە مایەوە بۆئەوەی فێری زانستو زانیاری ببێت!

خوێنەری ئازیز، سەرنج بدە، چۆن بە بە چاوێکی گەشبینانەوە، هەوڵی بەدیهێنانی خەونەکانی دا، ئایا تۆی خوێنەر لە هیواو ئاواتەکانت پاشەکشە دەکەیت، ئەگەر جارێك شکستت هێنا؟؟



# 10 زیرەكترین كەسایەتییەكانی جیهان

## 3 Christopher كریستۆڤەر هیراتا

هەركاتێ باسی زیرەكی دەكرێت، دەكەوینە بیری «ئەنیشتاین» كە زیرەكییەكی لە ڕادەبەدەری هەبووە، لیكۆڵینەوەكان دەریان خستووە، كە ئاستی زیرەكی لە نێوان ١٦٠ تا ١٩٠ دا بووە، بەڵام گەر بێتو سەیری ئەم سەدەیە بكەین، كەسانێك هەن ئەو ڕادەیەشیان تێپەڕاندووە، دەستنیشانكراون وەكو زیرەكترینی كەسایەتییەكانی جیهان. لە ژمارەی پێشوو باسی "تیرینس تاو"مان كرد، دووەم كەسایەتی كە دەست نیشان كراوە: "كریستۆڤەر هیراتا"یە كە گەردووناسێكی ئەمریكیەو ئاستی زیرەكییەكەی دەگاتە ٢٢٥ بەپێی پێوانەی زیرەكی جیهانیIQ.

**كورتەیەك لە ژیانی:**

كریستۆڤەر لە ٣٠ ی نۆڤەمبەری ١٩٨٢ لە ئەمریكا لەدایك بووە، خوێندنی ناوەندی لە قوتابخانەی «دیرفیلد»لە ساڵی ١٩٩٣ تەواو كردووە، دواتر چووەتە پەیمانگای تەكنیكی كالیفۆرنیاو لە ساڵی ١٩٩٧ بڕوانامەی لە بواری فیزیادا وەرگرتووە، پاشان چووەتە زانكۆی «برنستون»و لە ٢٠٠١ بڕوانامەی بەكالۆریۆسی لە ماتماتیك وەرگرتووە، هەروەها بڕوانامەی دكتۆراشی لە هەمان زانكۆ وەرگرتووە، پاشان بووەتە پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە فیزیای ئەستێرەناسی لە زانكۆی كالیفۆرنیا، ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنیكا پیتەردا، پێك هێناوە.

**نهێنی سەركەوتنی:**

كریس هەر لە منداڵییەوە بلیمەت بووە، لە تەمەنی ٣ ساڵی تواناكانی لە بواری ماتماتیك بەدیار كەوتووە، یەكەم ئەمریكی بووە كە توانیویەتی لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا، مەدالیای ئاڵتوونی لە ئۆلۆمپیاتی جیهانی بۆ فیزیاو ماتماتیك لە ١٩٩٦ بە دەست بهێنێت، لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا، دەستی بە كاركردن كردووە لەگەڵ دەزگای ناسا لە پرۆژەی فەراهەمكرنی ژیان لەسەر مەریخ، هەروەها توانیویەتی هاوبەشی بكات لە دیزاینكردنی تەلیسكۆبی ئاسمانی لەگەڵ گەردووناس دیڤید واینبێرگدا، یەكێكیشە لەو ٩٦ كەسەی كە لەلایەن سەرۆك ئۆباما خەڵاتی ڕێزلێنانی پێ بەخشراوە.

**كریس چۆن بە زیرەك ناسرا؟!**

هۆی بە زیرەك ناساندنەكەی دەگەڕێتەوە بۆ «مالك» كە سەرۆكی مامۆستایانی زانكۆی كالیفۆرنیا بەشی فیزیاو ماتماتیك بوو، خەڵاتی نۆبڵی بە شایستە زانی بۆی، باوانی كریس پلانیان دانا، بچن بۆ ویلایەتی كالیفۆرنیا؛ تا لەگەڵ كوڕەكەیان بژین وەك ئەوەی هەمووومان پێویستمان بە ژیانێكی ئارام هەیە؛ تا بتوانین لە كاتە دەرەنگەكانیش بە ئاسوودەیی لە هەوڵدا بین، ڕیچاردی باوكی دەڵێت: «ئێمە نامانەوێت هەموو شتێك بۆ كریس بكەین؛ تا بە هیچ شێوەیەك لە شێوەكان نەبین بە ڕێگر لە بەردەم كارو سەركەوتنەكانی».

سەرەڕای ئەوەی هیچ مرۆڤێك نییە، بتوانێت لە هەموو بوارەكانی ژیاندا سەركەوتوو بێت، بەڵكو سەرەتا مرۆڤ دەبێت خۆی بناسێتو ئەو بوارە لە خۆیدا بدۆزێتەوە، كە تێیدا بلیمەتو لێهاتووە، كریس بەهەمان شێوە لە زۆربەی بابەتەكانی دیكەدا كێشەی هەبووەو تێیاندا لاواز بووە، لە ئێستادا دەیەوێت لە نێوان ماددەی فیزیاو بیركاریدا یەكێكیان هەڵبژێرێتو زیاتر تێیدا قاڵ ببێتەوە؛ تا شوێن پێی خۆی لەو بوارەدا، بەهێز بكاتو بەرەو ئاستی دواتر هەنگاو بنێت. ئاشكرایە كریستۆڤەر، زانایەكی لاوی گەردوونییە لە بواری فیزیاو ئەستێرەناسیو بەدوای توێژینەوەی تیۆرییە؛ بۆ دەرخستنی ڕاستیی زانیارییە دراوەكان، كە لێكۆڵینەوەیان لەسەركراوەو بڵاوكراونەتەوە.

لە كۆتاییدا دەتوانین بڵێین: مرۆڤ كاتێك لە بوارێك لە بوارەكانی ژیاندا شكست دەهێنێت، مانای وا نییە، كە لە بنەڕەتدا مرۆڤێكی شكستخواردووە، بەڵكو دەبێت بەدوای ئەو لایەنەدا بگەڕێت، كە دەتوانێت تێیدا سەركەوتوو بێت.

ئا: نارین جووتیار

# چۆن کار لە کەسانی دی دەکەین؟

**٣- وشەی جوان، کاریگەریی زیاترە:**

لە گرنگترین ئەو شێوازانەی زانایانی دەروونناس، ئامۆژگاری پێ دەکەن بۆ درووستکردنی کاریگەری لەسەر دەوروبەر، وشەی جوانە، (الكلمة الطيبة).

دەکرێت بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی هاوڕێکانت وشەی جوان بەکاربهێنیت، تێڕوانینی ئەرێنییانە بۆ خۆت درووست بکەیت لە دڵو دەروونیدا؛ تا ڕێگا خۆش بکەیت بۆ گۆڕانکاری گرنگ کە ئەویش کەسێتیی بەسوودو سەرکەوتووە.

بنەمای مامەڵەکردن لەلای قورئان ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ البقرة: ٨٣. واتە: گوفتاری چاکو جوان بەڕووی خەڵکیدا بڵێن.

بەکارهێنانو هەڵبژاردنی وشەو دەستەواژەی جوان، بۆ گفتوگۆکردن لە پیشەی کەسانی کاریگەرە.

پێویستە پرسیار لە خۆت بکەیت، هاوڕێکانت بە چ سیفەتو هەڵسوکەوتێکت سەرسامن (بە ئاکارجوانی، وتەشیرینی، ڕەفتاربەرزی، بەوەفایی، دڵسۆزیو ڕاستگۆییو خەمخۆریت بۆ هاوڕێکانت) گەر هەر یەکێك لەمانە، وای کردبێت هاوڕێکەت وابەستە کردبێت بە خۆتەوە ئەوە دەتوانیت کاریگەری درووست بکەیتو لە ڕێگەیانەوە پەیامەکەت بنێریت.

**٤. دەست بە هەڵەکەتەوە مەگرە:**

واتە: سوور مەبە لەسەر ئەو هەڵەیەی کە کردووتە، یان دەتەوێت بیکەیتو هاوڕێکانیشت دەزانن کە تۆ لەسەر هەڵەیت، چەندە قوتابییەکی خاوەن ئەزموونو سیفەتە جوانەکان بیت، سووربوونت لەسەر هەڵە، کاتێك کە بزانیت هەڵەیە؛ ئەوا دڵنیا بە پۆشاکی سیفەتە جوانەکانت لەبەردا دادەماڵێتو لەلای هاوڕێکانیشت کەسێکی خاڵییت لە ئاکارە مەزنەکان.

(دیل کارینگی) دەڵێت: داننان بە هەڵەدا فەزیلەیەو لە چاوی خەڵکدا بەرزت دەکاتەوەو هەوڵ مەدە ڕاستییەکەت بسەلمێنیت لە کاتێکدا دەزانیت لە هەڵەدایت، بەڵکو هەوڵ بدە لەوتوێژدا نەرمونیان بیتو دان بە هەڵەکەتدا بنێیت.

ئەم شێوازە تێڕوانینێك بەوانی دیکە دەدات، کە تۆ ڕاستگۆیتو متمانەیان بە تۆ زیاتر دەبێتو کاریگەریت لەسەریان پتر دەکات.

یەکێك لەو خاڵانەی لە ئیسلامدا بنەمای پەیوەندیی کۆمەڵایەتییەکانی لەسەر بنیات نراوە، ئەویش ئەم فەرموودەیەیە کە دەفەرمووێت: (هەموو ئادەمیزادێك هەڵە دەکات، باشترین هەڵەکارانیش تەوبەکارانن).

**٥. ڕاستگۆیی کورتترین ڕێگای بەدەستهێنانی کەسانی دەوروبەرە:**

ڕاستگۆیی ڕۆژئاواییەکان لەمامەڵەدا لەبەرئەوە نییە، کە ئاینەکەیان فەرمانی پێ کردوون، بەڵکو لەبەرئەوەیە بۆیان دەرکەوتووە (ڕاستگۆیی بنەمای سەرکەوتنو پێشکەوتنە لە ژیاندا) خەباتکارانی بواری دەروونناسیو ئەوانەی کار بۆ بەختەوەربوونی مرۆڤ دەکەن، جەخت دەکەنەوە کە کورتترین ڕێگا بۆ بەدەستهێنانی خەڵکانی دیو درووستبوونی کاریگەری لەسەریان، ڕاستگۆییە لە گوفتارو کرداردا.

گەر بتەوێت کاریگەری لەسەر هاوڕێکانت درووست بکەیت،



بەشی دووەمو کۆتایی

ڕێبوار سابیر ماستەر لە مافەکانی مرۆڤ

دەبێت بۆ تەنها چرکەیەکیش، لە سیفەتی ڕاستگۆیی جیا نەبیتەوە، با گوتنی ڕاستگۆیی بە زیان بەسەرتدا بشکێتەوە.

ڕاستگۆیی لە مامەڵەی ژیانی ڕۆژانەتدا، لەگەڵ هاوڕێکانت لە بینینو خوێندنەوەدا، لە گێڕانەوەو ئەمانەتدا، لە درووستکردنی هاوڕێیەتیو پەیوەندیدا، لە تەواوی مامەڵەی ژیانتدا.

لەئیسلامیشدا ڕاستگۆیی لە گوفتارو کرداردا دوو بنەمای سەرەکیو گەورەن، مرۆڤ لەنێو بازنەی موسڵمانبووندا دەهێڵێتەوە.

٦. وشەی نەخێر بەکار مەهێنە:

نەخێر... نا...وا مەکە....نەکەیت... ناتوانیت... بێهێزیت...هتد... وشەگەلێکی نەرێنین، بەپێی توانا هەوڵی لێ دوورکەوتنەوەیان بدە.

لەبری ئەم دەستەواژە نەرێنییانە، کە ئاڕاستەی بەرامبەری بکەیت، لە پێشکەوتنو داهێنانکاری دووری دەخەیتەوە.

دەتوانیت بیانگۆڕیت بۆ (پێت چۆنە ئەم کارە ئەنجام نەدەیت، ئەم کارەم پێ باشترە، بە بۆچوونی من وایە، لەوانەیە ئەم کارە زیاتر پێویست بە هاوریکاری بکات)، یان هەر دەستەواژەیەکی دی کە بەرامبەر سفر نەکاتەوەو ڕێگەی بیرکردنەوەی لێ نەگرێت.

دانایانی ( پڕۆگرامسازی دەماری) بۆیان دەرکەوتووە: مرۆڤە گەورەکانو مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا بە ئامۆژگارییە، نەك بەهەڵەزانینی خەڵكو زەمکردنو سەرزەنشتکردنیان.

کەواتە: گەر دەتەوێت کاریگەریت هەبێتو تێڕوانینی بەرامبەر بەخۆت ئیجابیانە بێت، دەستەواژەی نەرێنی مەنێرە بۆ مێشکی هاوڕێکانتو ئامۆژگاریکردنی گونجاوو دڵسۆزانە پەیڕەو بکە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ١٠ ساڵ لە قوتابخانە دەروونییە بەناو بانگەکەی پێغەمبەر (ﷺ)دا ژیاوەو خزمەتی ئەو زاتە گەورەیەی کردووەو دەڵێت: لەو ماوە زۆرەدا، بۆ تەنها جارێك پێی نەگوتوم وامەکە – بۆچی ئەوەت کرد.

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە سەدەی تازەدا ئەنجام دراوە، کە لە ١٧٪ پەیامو ئامانج بە قسەکردن دەکات ٨٠٪ بەشێوازی جۆراو جۆرو دوور لەقسەکردن ئەو پەیامە دەگاتە بەرامبەر.

بانگخوازی بەناوبانگی میسری: حەسەن بەننا دەڵێت: دوور بکەونەوە لە قسەو قسەلۆك، کەسانێکی کرداری بن. واتە: ئەوەی دەتەوێت بیکەیت، بەکردەوە بیسەلمێنە، نەك فەرمانکردنو قسە.

٧. خۆبەگەورەزانین، خراپترین سیفەتە لە مرۆڤدا هەبێت:

هیچ کاتێك مرۆڤی خۆبەزلزان خۆشەویست نەبووە، خۆ بەشت زانین واتە: ئەو بەربەستە گەورەو ئەستوورە لە نێوان تۆو هاوڕێکانتدا، کە نایەڵێت کاریگەری لە سەریان درووست بکەیت، بەردەوام دەبێت بە جێگای ڕەخنەو کەم بایەخی لایان، تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکیو هاوڕێکانتداو بەشداریکردنیان لە خۆشیو ناخۆشییەکاندا، کاریگەریت لەسەریان زیاتر دەکات، خۆبەزلزانینو گەورەییو دوورکەوتنەوە جگە لە ڕقوتووڕەیی بەرامبەر هیچی دی بەدوای خۆیدا ناهێنێت.

خاکیبوون خۆپەراوێزنەخستن پلەوپایەی کارتێکردنت زیاد دەکات، کار لە کەسانی دی کردن، یاسایەکی هەیە، پێی دەگوترێت: (یاسای تارد) ئەویش یاسای (نادیاری دیار)ە، کە دەڵێت: کرداری کارتێکردن پەیوەندیی هەیە لەنێوان ئەوەی کە دیارە لە هەستدا، لەگەڵ ئەوەی کە نادیارە لەناخدا.

چاولێکەری ناوەکی (التقليد الباطن) دەکەوێتە پێش چاولێکەری دەرەوە (التقليد الظاهر).

بەو واتایەی ئەگەر ئێمە توانیمان کەسێك بین، کاریگەری درووست بکەین لەسەر هاوڕێو بەرامبەرەکانمان، جا بەهۆی ئاکارو ڕەفتارەوە بێت، یان گوفتارو بینراوو نووسراو خوێنراوێکمانەوە بێت...... یەکەم جار بیرو باوەڕو قەناعەتی ناوەوەی دەست بە بڕیاردانو جوولە دەکات، پێش لاساییکردنەوەو ڕووکارە دەرەکییەکان... کەواتە: دەتوانین بڵێین:

گواستنەوەی بیروباوەڕو قەناعەت، خێراترە لە گواستنەوەی دەستەواژەو قسەکردن.

ئەگەر دەتەوێت کاریگەری درووست بکەیت، دەبێت بزانیت ئەو کاتو ساتانە کامانەن، کە دەتوانیت کاریگەرییان تێدا درووست بکەیت؛ تا بەجوانی بەرامبەریش ئامادەیی (التقليد الباطن) بێت.

مرۆڤ دەتوانێت لە هەرکا تێکدا، ببێت بە جەمسەری کاریگەری بەهۆی بیروباوەڕو متمانەبەخۆبوون (باوەڕ بە سەرکەوتن نیوەی سەرکەوتنە) ئەو پلانو ئامانجانەی دەستنیشانی دەکات؛ چونکە مرۆڤی بێپلان، پلانی کەسانی دی جێبە جێ دەکات.

لەکۆتاییدا دەڵێین: هونەری کاریگەریی درووستکردن لەسەر هاوڕێکانت پێویستە، هەندێ گۆڕانکاریی دی هەیە؛ تا بتوانیت هونەری کارتێکردنەکەت بەهێز بکەیت.

فەرهەنگێك لەوشەی کاریگەرت پێویستە؛ تا گۆڕانکاری لە دەستەواژەو قسەکانتدا بەدی بکرێت بەرەو باشترو دوورکەوتنەوە لە وشەی کەمماناو دەستەواژەی درێژ.

تێڕوانینو گەشبینی، پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ هاوڕێکانت بەهێز دەکات، ئەگەر نەتوانیت مرۆڤ درووست بکەیت، هەڵسوکەوتو مامەڵە ئامانجدارەکەت سەرنجی هاوڕێکانت بەرەو باشتر کەمەند کێش دەکات.

دوور لە تووڕەییو هەڵچوون خولیای چارەسەرکردنی گرفتی هاوڕێکانت بێت.

پێش ئەوەی بزانیت باری دەروونی هاوڕێکانت چۆنەو گیرۆدەی چ گرفتێك بوون، مەیاندە بەر ڕەخنەو گلەیی.

لە گەیاندنی پەیامو بۆچوونەکەت بە هاوڕێکانتدا، باوەڕی تەواوت بە خۆت هەبێت، چونکە باوەڕ بە سەرکەوتن نیوەی سەرکەوتنە.

دوو هەڵەی خاوەن پەیامەکان:

ئامۆژگاری پێش تێگەیشتن:

١. پێویستە لە مرۆڤو هاوڕێکانت تێبگەیت لە ڕووی (دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئایدۆلۆژی) پاشان دەست بکەیت بە ئامۆژگارییەکانت.

٢. هەوڵدان بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندی بەبێ چاکسازی، لە هەڵوێستو ڕەفتاردا.

پێویستە خۆت لەو هەڵەیە بپارێزیت؛ تا بتوانیت بەگەورەیی کاریگەریت هەبێت، (ئیمرسۆن)ی حەکیم دەڵێت: تۆ بەشێوەیەك ئامۆژگاریم دەکەیتو دەقیژێنی بە گوێمدا، ناتوانم گوێم لەوە بێت، کە دەیڵێیت.

# دنیام ئاوا دەوێ...

سەروەر عومەر



دنیام ئاوا دەوێ.. ماڵێک پڕ لە پەنجەرەی کراوەی نیگاو کوانووی گەرمی میانە، ئاسمانێکی سەرتاپا شین، پڕ لە کۆترو کۆلارە.

دنیام ئاوا دەوێ.. زاری دایەگەورەکان پڕ لە حیکایەت، دەستی منداڵەکان پڕ لە شیرینی، دڵی گەورەکان پڕ لە سادەیی، سینەی شەقامەکان پڕ لە هەنگاوی ئەو ڕێبوارانەی بەرەو ڕووناکی دەڕۆن، سۆمای چاوەکان پڕ لە تیرۆژی ڕوانینو لە شەپۆلی میهرەبانی، زمانی خامەکان پڕ لە ڕستەی "خۆشم دەوێی".

دنیام ئاوا دەوێ... قەسابەکان دوکانەکانیان بکەنە گوڵفرۆشی، گشت مەیخانەکان بکرێنە کتێبخانە، تەواوی زیندانەکان بکرێنە مۆزەخانە، لوولەی تفەنگەکان بکرێنە شمشاڵ، قەوانی گوللەتۆپەکان، تێکڕا بکرێنە ئینجانە.

دنیام ئاوا دەوێ... پڕ لە خورەی کارێز، پڕ لە بۆنی سەوزەگیا، پڕ لە فڕینی سوێسکەو کلاوکوورە، پڕ لە سەربوردەی کوێرە ڕێگاو بەستەی کانیو دەستو گۆزە.

دنیام ئاوا دەوێ... دەفتەری یادگارییەکان هەمیشە سەوز، بەرهەیوانەکان پڕ لە هێلانەی پەرەسێلکە، باخچەکان پڕ لە بەیبوونو شەوبۆ، حەوزەکان پڕ لە خەپلەی زیوینی مانگ.

دنیام ئاوا دەوێ... پەپوولەی ماچی هیچ لێوێک، لە ترسان پەنا بۆ پشتی دەستی هیچ گەورەیەک نەبا، بارانی گریانی هیچ عاشقێک، بێ پەلکەزێرینە نەبێ، گیرفانی هیچ کەسێک، لە خۆشی بەتاڵ نەبێ، گەنجینەی هیچ ماڵێک، زەردەخەنەی لێ نەبڕێ!

دنیایەکم دەوێ، تیایدا فەرشی تەواوی مەوداکان، هەڵگیرێنو هەرچی گوتەی "دووریو دۆستی" هەیە لە کتێبەکاندا بیسڕنەوە، دنیایەکم دەوێ، تیایدا هەمووومان منداڵانە بژینو منداڵانە شەڕ بکەینو ئاشت ببینەوە!

دنیایەکم دەوێ، تیایدا هەموو دەممان بۆنی شیری خاوی دایکمانی لێ بێت، دنیایەکم دەوێ تیایدا تەواوی کرمەکان بە پەپوولەیی لە قۆزاخە بێنە دەرەوە!

دنیایەکم دەوێ، تیایدا ماستی خەیاڵی هیچ کەسێک، مووی پیلانی تێدا نەبێت. هیچ گورگێکی چنگاڵتیژ لە ژێر پێستی هیچ مەڕێکدا، جێگەی نەبێتەوە!

دنیایەکم دەوێ، تیایدا هەمووومان لە خەمی کڵاوی بابردووی ئەوانی دیکەدا بین، دنیایەکم دەوێ، تیایدا بەرەی ژیانی هیچ کەسێک لەلای تەنکییەوە نەدڕێ، دنیایەکم دەوێ، تەواوی ڕاوچییەکان، هەموو ئێوارەیەک بە دەستی بەتاڵەوە بگەڕێنەوە، قریشکەی درەختەکان گوێی تەوروەشێنەکان کەڕ بکات، دنیایەکم دەوێ، بێ ڕووپۆش وەک دیمەنی دوای بارانی باخێک!

دنیایەکم دەوێ، بێ ڕتووش وەک ئاوی زوڵاڵی کانییەک، دنیایەکم دەوێ، تەواوی چرکەساتەکانی پڕ بن لە خەیاڵی ناسکی شیعرێک، کوڕەمنداڵەکان، لە جیاتی پێڵاوی گەورەکان، لاپەڕەی سپیی دەفتەری وێنەی قوتابخانە بۆیە بکەن، کیژۆڵە کەزیە ژاکاوەکان، لە جیاتی هەرزانفرۆشکردنی گوڵەنێرگزەکان لەسەر شەقامە گشتییەکان، ئەو گوڵە زەردانە بدەن لە پرچی زەردی بووکەڵە چاوەڕوانەکانیان. دنیایەکم دەوێ، هەموو بەیانییەک خۆر تیایدا عاشقانە هەڵبێتو ئێوارە دێوانەئاسا ئاوا ببێ، دنیایەکم دەوێ، لە جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤەکانیدا هاتبێ: هەر مرۆڤێک عاشق نەبێ، دەبێ گومان لە مرۆڤبوونی بکرێ! یاخود لە بەندێکی دیکەیدا نووسرابێ: هیچ مەعشووقێک مافی ئەوەی نییە عاشقەکەی جێ بهێڵێ. دنیایەکم دەوێ، تیایدا هیچ پەنجەرەیەک زیندانی نێو دیوار نەبێ، دنیا هەمووی پەنجەرە بێ، دنیایەکی شووشەیی. دنیایەکم دەوێ، گەورەترین ئاواتی مرۆڤەکانی، خستنە سەریەکی پارە نەبێ، دنیایەک، تیایدا ئارەزوو لە خەون گەورەتر نەبێ، دنیایەکم دەوێ، تیایدا سەرۆکو پادشاکان گوێ لە مۆسیقا بگرن، شیعر بنووسن، عاشق ببن، دڵیان بشکێو بگرین، دنیایەکم دەوێ، گەردنی هیچ دەرگایەک، تەوقی قوفڵی پێوە نەبێ، پەپوولەی دڵی سادەی هیچ جوانێ، لە تۆڕی ڕەشی ئارەزووبازەکاندا گرفتار نەبێ، دنیایەکم دەوێ، تەواوی تابلۆکانی پڕ لە زەردەخەنەی مۆنالیزاکان بێ، دنیایەکم دەوێ، تەواوی ڕووداوەکانی پڕ لە پاڵەوانی حیکایەتەکان بێ، دنیایەکم دەوێ، تیایدا کەمانی زمان، تەنهاو تەنها ئاوازی دڵ بژەنێ.

من دنیام ئاوا دەوێ....



# پشووبدەن

زاهیر زانا سەیدگوڵ

پشوودان واتە: بەتاڵکردنەوەی ڕۆحو جەستە لە هیلاکیو ماندوێتیو نوێکردنەوەو چالاککردنەوەی بۆ دووبارە کارکردنو هەوڵدانو تێکۆشان، پشوودان واتە: دوورکەوتنەوە لە بێزاریو ڕۆتینو یەك قاڵبیو بێزاری، زۆرجار گەر کەسێك تەواو ماندوو ببێت؛ بۆئەوەی پشوو بدات، دەڵێت: "خۆ مرۆڤ ئامێر نییە". هەرچەندە هەموو ئامێرێکیش، پێویستە پشووی پێ بدرێت بۆ دوورکەوتنەوە لەتێکچوونو لەناوچوون، ئەمە ئەگەر بۆ ئاسنێکی بێرۆحو بێگیان بەو شێوەیە بێت، ئەی بۆ ئێمەی مرۆڤ کە خاوەنی هەستو سۆزینو ڕووداوو بارودۆخەکان، کاریگەری دەکەنە سەرمان، بۆیە پێویستە خۆمان نوێ بکەینەوەو چەند کاتێك دابنێین بۆ پشوودانی جەستەو ڕۆحمان، لەبەرئەوەی ئەگەر پشوو بە خۆمان نەدەین، تواناو گوڕو تینمان کەم دەکاتو بەرهەممان کەم دەبێتەوەو وەك کابرای دار بڕمان لێ دێت، کە دەگێڕنەوە: کابرایەك چووە بۆ داربڕین، یەکەم ڕۆژ دە داری بڕیوە، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ، ژمارەی داربڕینەکانی کەم بووەتەوە، لەبەرئەوە بێزاربووەو چووە بۆ لای دانایەك؛ تا هۆکاری کەمبوونەوەی بەرهەمەکەی لێ بپرسێت، پاش ئەوەی دەچێتە لای باسی بۆ دەکات یەکەم ڕۆژ ئەونەی دار بڕیوەو دواتر ڕۆژ بەڕۆژ کەمی کردووە، داناکە لێی دەپرسێت: دواینجار کەی تەورەکەت تیژ کردووەتەوە، ئەویش دەڵێت: هەر تیژم نەکردووەتەوە! بۆیە داناکە پێی دەڵێت کە دەبێت تەورەکەت تیژ بکەیتەوە، ئەگینا ناتوانیت بەردەوام بیت.

ئەزیزان ئێمەش دەبێت پشوویەك بدەین؛ بۆئەوەی تەوری تواناو لێزانیو بیرو هزرمان تیژ ببێتەوەو باشتر بتوانین بەردەوامی بە کارەکانمان بدەین، ئێمە ئەگەر پشوو نەدەین کارکردنو بیرو هزرمان قاڵبێك وەردەگرێت، کە بەرەوپێشچوونێکی وا بەخۆیەوە نابینێتو هەمیشە بەیەکجۆر بیر دەکەینەوەو کاردەکەینو شتێکی تازە تاقی ناکەینەوەو بیرۆکەیەکی نوێ ناهێنینە ئاراوە.

پشوودان وەك ئاوێکی سازگار، دەروونی گرژو بێزار دەشواتەوەو بەدونیابینییەکی تازە، نوێی دەکاتەوەو بایەخو نرخو خۆشەویستی کارکردنمان لەلا زیاتر دەکات، ئەگەر پشوو نەدەین، ناتوانین بەردەوام بین وەك ئەو کەسەی کە بەسەر چیایەکدا سەردەکەوێت ئەگەر جاروبار نەفەسێك نەداتو کەمێك نەحەوێتەوە؛ ئەوا ناتوانێت بەردەوام بێتو بگاتە لوتکەکانو سەرکەوتنەکان تۆمار بکات، ئەوەی دەبێت لێی بەئاگابین، ئەوەیە بیرمان بێت ئێمە دەبێت پشوویەك بدەینو هەستینەوەو خۆمان ڕێك بخەینەوەو ئامانجی خۆمان بیر نەچێتەوەو خۆشیو لەزەتە کاتییەکان مەنزڵە گەورەو ڕازاوەکانمان لەبیر نەبەنەوە.

ئەزیزان، مەرج نییە بۆ پشوودان بچینە دەرەوەی شارو وڵاتو سەفەرێکی تووڵانی بکەین، بەڵکو دەشێت هەر لەسەر کورسیی کارکردنەکەمان ئیسترخایەك بکەینو چەند هەناسەی قووڵ هەڵبمژین، یاخود پیاسەی ناو پارکێك بکەینو پشوویەك بەدڵو دەروونمان بدەین، گوێ لە چریکەی چۆلەکەیەك بگرینو خەمو کێشەو گرفتەکان لەبیر بەرینەوە، یاری لەگەڵ منداڵێکدا بکەینو وەك ناخی ئەو سادە ببینەوەو لەگەڵ پێکەنینی بەریئی ئەودا، دەروونمان لە گرفتەکانی ڕۆژگار دابڕنین، بەڕێزان هیچ کات مەڵێن: کاتمان نییە بۆ پشوودان، وەك تۆماس هایس دەڵێت: (باشترین کات بۆ پشوودان، کاتێکە کە هیچ کاتێکت نییە بۆ پشوودان). بێگومان ساتە ئاڵۆزو قەیراناوییەکان، پێویستیان بە پشوودان زۆرترە؛ چونکە زووترو زیاتر بارگاوی دەبین بە کێشەو گرفتو ناهەمواریيەکانو دەبێت زووتریش خۆمان لەو بارگانە بەتاڵ بکەینەوە، تاوەکو کاریگەری نەکەنە سەر چۆنێتیی بیرکردنەوەمانو لە هەڵەو کەموکورتی خۆمان بپارێزین، پشوودان گرنگییەکی تایبەتی هەیە، بۆیە مامۆستای مرۆڤایەتیش ئامۆژگاریمان دەکات، کە (جەستەشمان مافی هەیە بەسەرمانەوە) یەکێك لەو مافانەش، بریتیە لە پشوودانو حەوانەوە.



# قانع

## شاعیری چەوساوەکانی کورد

قانع لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا، بە شاعیرێکی دڵسۆزو خەمخۆرو نیشتمانپەروەرو عاشقی سەربەستیی کوردستان دەناسریو ڕێزی دەگیرێت، قانع شاعیرێکی بەناوبانگی کوردە، بە هۆی شیعرەکانییەوە بە «شاعیری چەوساوەکانی کوردستان» ناوبانگی دەرکردووە. شیعرەکانی قانع، هەوێنی بیرێکی پێشکەوتووخوازانەیە.

لە بارەی شوێنی لەدایکبوونی شاعیری گەورەی کورد، مامۆستا (قانع) خۆی دەڵێت:

لە ئەسلا خەڵکی دۆڵاشم
مەریوانە شوێنی ئەژدادم.
محەمەد (کابلی)م ئەمما،
بە تەخەلوس(قانع)م.

دوای ئەوەی دەرەبەگەکانی ناوچەی مەریوان، باوکی ئەم شاعیرە ئاوارە دەکەن، بەدەم لێقەوماوییەوە، قانع وەکو منداڵی دەربەدەرێك لە (١٥ی ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٨) لە گوندی «ڕێشێن» لەدایکبووە، ئەو سەردەمەی قانعی تێدا لەدایکبوو، سەردەمی زوڵمو ستەمی دەرەبەگایەتی بووەو بنەماڵەی (قانع)یش وەك باقیی خەڵکی هەژارو بێدەرەتان، لەژێر ستەمو بێدادیی ئاغاواتدا بوون. هەر لەبەرئەوە زۆرجار، ناچار بە جێگۆڕکێو ئەم دیوو ئەو دیو بوون. قانع هەر لە سەرەتای هاتنە دونیایەوە، تێکەڵ بە ناخۆشیو دەردەسەریو لێقەوماوی بووە. سەرباری نەبوونیو نەداریو ستەمی ئاغاکان، قانع دوچاری دەردەسەرییەکی گەورە هات، تەمەنی قانع تەنها (٤٠) ڕۆژ بوو، باوکی کۆچی دوایی دەکاتو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان دەکات، ئەمە کۆتا خەمی ئەم مەلۆتکەیە نەبوو، بەڵکو زۆری نەخایەند، مەرگی دایکی ئازیزی دێتە سەرو ئەویش بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کردو (قانع)یان بێ داکوبابو بەتەنها جێهێشت!

منداڵێکی بێدایکو باب لەو سەردەمە پڕنەهامەتیو ناڕەحەتیو نەداریو دواکەوتوویەدا، ئاخۆ چ ژیانێکی بووبێت؟

پاش مەرگی باوکو دایکی، ماوەیەك مامەکانی لەخۆیان گرتووە. بەڵام ئەو لەخۆگرتنە بەنابەدڵی دەبێت، زۆرجار شەوانەی لەسەر تەنوورو ڕۆژانی لە نێو منداڵاندا بەسەر بردووە! تا ئەوەی خزمێکی دووریان بەناوی (سەید حەسەن)، دەیباتە لای خۆیو پاشان دەینێرێتە بەر خوێندنی مەلایەتی.

لەم بارەوە قانع دەڵێت:

هەزار ڕەحمەت لە ئارامگاهی بەرزی سەییدی چۆڕی
کە منداڵ بووم، بە لوتفی خۆی، مەسیری ژینمی گۆڕی

بەڕاستیش لێرە بەدواوە ژیانی قانع گۆڕانی بەسەردا دێت. لە تەمەنی مێردمنداڵییەوە، جارجار شیعر دەهۆنێتەوە. بەڵام شیعرەکانی سەرەتاییو دەچنە مایەی پەندو تەنزەوە. شانبەشانی خوێندن لە حوجرەی فەقێیاندا، هەستێکی دژی دەرەبەگایەتیش لە ناخیدا سەر هەڵدەدات. هەر ئەوەش دەبێت بەهۆی ئەوەی کە هەموو دەرەبەگەکانی ناوچە، بەتایبەت ئاغاکانی بەری بەگزادەی ڕۆژئاوای دەریاچەی زرێبار، ڕقێکی زۆریان لێ بێت. تا گەیشتووەتە ئەوەی لای حکومەتی ئێرانی، سکاڵای لە دژ تۆمار دەکەنو چەند جار بەگرتیان داوە!

### ژیانی لاوێتیی قانع:

لە سەرەتای لاوێتیدا دوچاری نەخۆشیی تەنگەنەفەسی دەبێتو تا دێت لێی زیاد دەکات، لە ئەنجامدا هەر بەو ئازارەوە سەری نایەوە. ئەو ناکۆکییە خێڵەکییانەی نێوان بنەماڵەی شاعیرو دەرەبەگەکانی ناوچەی مەریوان، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەناو جموجۆڵی فیکری شاعیردا زیادی دەکرد. ئەمە لە لایەك، لە سەرەتای بیستەکانیش بە دواوە کە ناوبەناو هەواڵی پەیوەندیی سیاسییانەی توندوتۆڵی هاریکاری نێوان کۆڕو کۆمەڵو تاقمە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەی باکووری کوردستانو کەمالییەکان دەگەیشت، بێ ئارامی خۆی، شیعری دادەگرت.. دیسانەوە لە لایەکی تریشەوە، سەرکەوتنی شۆڕشە مەزنەکەی ئۆکتۆبەرو سەرەتای بڵاوبوونەوەی بیرو باوەڕی پێشکەوتووخوازانەی دژ بە فاشیزم لە نێو توێژو کۆمەڵە خوێندەوارەکاندا، ئەمانە هەموو زەمینەیەکی نیشتمانپەروەرانەو نەتەوایەتییانەیان خوڵقاندبوو، پاشگەزبوونەوەی کەمالییەکان بەرانبەر مەسەلەی کوردو بەرپابوونی شۆڕشە ناوبەناوو پچڕاوو یەك لەدوای یەکەکانی باکووری کوردستان (ئاگری داخ) بیرو باوەڕی زۆربەی لاوە خوێندەوارەکانی خستە بەر مەودایەکی نەتەوایەتیو نیشتمانیانەی کاریگەر.

هاوکات بەهۆی شەڕی دووەمی جیهانییەوە، بیروباوەڕی پێشکەوتووانە لەوڵاتدا پەرەی سەندو ئەم پەرەسەندنەش بوو

بەهۆی زیاتر هاندانی شاعیر لە دژی ڕژێمی دەرەبەگایەتی. ئەو ناکۆکییە خێڵەکییانەی نێوان شاعیرو چەند دەرەبەگێك گۆڕایە سەر شێوەی کێشەیەکی سیاسی دژ بە تێکڕای ڕژێمەکە. هەرچەندە مەودای بیرکردنەوەی لە کێشەی نێوان خاوەن موڵكو ڕەعیەتەکان قووڵتر بوایەتەوە، ئەوەندە هەڵوێستی بەرانبەر تێکڕای دەرەبەگایەتی توندتر دەبوو، لەم قۆناغەدا شاعیر تێکەڵ بە ئەدەبی شۆڕشی نهێنی بوو.

لەبەرئەوەی کۆمەڵگای کوردەواری ئەو سەردەمە کۆمەڵگایەکی ئاغایی‌و دەرەبەگایەتی بووە، سرووشتی کۆمەڵگاکەمان لە وڵاتێکی پیشەسازی نەچووە، کە دەسەڵاتی سەرمایەداران خەڵکیان چەوساندبێتەوە، لەبەرئەوە شیعرەکانی بە زۆری لەگەڵ جوتیاراندا دەدوێ‌و بەرهەڵستی دەرەبەگەکان دەکات. شاعیر لەو باوەڕەدا بووە، کە لە وڵاتێکی فرەنەتەوەدا، ئاستەمە کە هەموو نەتەوەکانی ناو چوارچێوەی ئەو وڵاتە، وەك یەك بژین‌و لە ڕووی یاسای کۆمەڵایەتییەوە یەکسان بن‌و ئابووری وڵات بە ئابووری هەموو نەتەوەکان وەك یەك بدرێنە قەڵەم‌و وەکو یەك سەربەستی سیاسییان پێ بدرێت، بۆیە هەمیشە لە هەڵوێستی سیاسییانەی نەتەوە سەرەکییەکانی ئەو جۆرە وڵاتانە سڵەمیوەتەوەو لە شیعرەکانیدا ئەمەی بە لادێنشینەکان گەیاندووە.

* قانع وەکوو باقی فەقێکانی کوردستان زۆربەی شارەکانی کوردستان دەگەڕێت بۆ فێربوونی زانستو زانیاری لەوانە (سنە، مەهاباد، شنۆ، هەولێر، کۆیە، کەرکوك، سلێمانی‌و بیارە)، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ مەریوان.

دوای گەڕانەوەی بۆ مەریوان، قانع ژیانێکی سەقامگیری نابێت، بەهۆی دژایەتییکردنی ئاغاواتەوە، هەمیشە لە لایەن چەکدارەکانی حکوومەتی ئێران‌و چڵکاوخۆرانی ئاغاکان دژایەتی کراوە.

قانع بۆ بژێوی ژیانی بێجگە لە مەلایەتی، خۆی بە کارەکانی (ڕۆژنامەگەریی، ئاشەوانی‌و موچەخۆری حکوومەتو...) ئەنجام داوە. قانع مرۆڤێکی دەروونبەرزو سەربەرز بووەو باوەڕی بە نوێبوونەوە بووەو هیچکات لە یەك شوێنداو لەیەك بۆچووندا قەتیس نەماوە. ڕەنگە بۆ ئەو سەردەمە نەتوانین وێنەیەکی دیکەی وەك مامۆستا قانع ببینینەوە، کە وەك ئەو توانیبێتی لەگەڵ کاتو زەمان بچێتە پێش‌و خۆی بەرۆژ بکات.

قانع هیچکات چەوساوەکان‌و هەژارانی نەك هەر لەبیر نەکردووە، بەڵکو خۆی شێوەیەك لە ژیانی هەڵبژارد، کە بێ سێ‌و دوو خستیە ناو چینی چەوساوەوە. بۆیە لە ناخی دڵەوە ناعەدالەتی‌و چەوسانەوەی هاوار دەکردو زەحمەتکێشانی بۆ مافخوازی هان دەدا.

## با هەموو جووتیارو پاڵەو ڕەنجدەران یەکگرن؛ تا دەبنە هێزو پشتیوان

گەر چاو لە سەرجەم دیوانەکانی قانع بکەین، بەشی هەرە زۆری باسی کوردو کوردستان‌و مەینەتو چەرمەسەریی ئەم نەتەوەیەو هاوکات هاوار بۆ بە دەوڵەتبوون‌و سەربەخۆیی کوردستانە. ئەگەرچی قانع لە درێژەی تەمەنیدا قۆناغی فیکریی جیاوازی ئەزموون کردووە، بەڵام هەمیشە لە یەك ڕوانگەدا ڕاوەستاو بووە، ئەویش کوردبوون‌و بانگەشەی نەتەوەبوونی کوردو ڕزگاریی کوردستان. هەر لە تەمەنی لاوێتی، کە جیاوازیی‌و ستەمی چینایەتی (دژی دەرەبەگەکان) هەست پێ دەکات، هاوکات خۆی دەناسێت‌و وەها هەستی نەتەوەیی بەرزو قووڵ بووە، کە خەباتی چینایەتی (دژی دەرەبەگایەتی) نەیتوانیوە، بەسەر هەستی نەتەوەییدا زاڵ ببێت. قانع هەمیشە هەستی نەتەوەیی‌و خەبات بۆ ڕزگاریی کوردستانی لە پێشەوەی کارەکانی دیکەی داناوەو بانگەشەی بۆ کردووە. هەر ئەو هەستەیە، کاتێك دەبیستێت لە مەهاباد بە ڕێبەریی قازی موحەممەد، بزاوتێکی ڕزگاریخوازانە سەری هەڵداوە، دەستبەجێ (بەپیادە) بەرەو مەهاباد تێی دەتەوێنێتو پێش ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان‌و هەڵکردنی ئاڵای کوردستان(٢ی ڕێبەندان) خۆی دەگەیەنێتە مەهاباد. قانع هەتا ڕووخانی کۆمار لە مەهاباد دەمێنێتەوەو (بە تەواوی تواناوە) خزمەتی کۆمار دەکات. هەر لەو ماوەدا چەند شیعری بە سەر کۆمارو پێشەوادا هۆنیوەتەوەو پاش ڕووخانی کۆماریش ئەوەی دەروونی پڕ لە خەفەتی بووە لە قاڵبی شیعردا دەری بڕیوە.

* قانع شیعری کۆمەڵایەتیشی تێکەڵ بە پەندو تەنز دەهۆنییەوە، لە بواری ئومانیزم‌و ژینگەپاراستن، قانع چەندان شیعری هۆنیوەتەوە، کە بەناوبانگترینیان "کۆترو ڕاوچی"یە کە شێعرێکی دوورو درێژو پڕ هەستو بەناوەرۆکە. لەبارەی کۆمەڵناسییەوە، شیعرەکانی "فێڵبازی ڕێوی"و "مشکو پشیلە" کە تەنزن لەسەر گیانداران کە بە زبانێکی ساکار لە کۆمەڵگەو دەسەڵاتو دین‌و پێوەندییەکانی کۆمەڵایەتی (دەرەبەگایەتی) دواوە. (چۆنێتیی ماڵ بەشکردنمان)، تەنزێکە لە سەر تەماحی ماڵی دونیا کە برا دەخاتە گیانی یەکتر. لە "چۆنێتیی باوك مردنمان"دا باسی دابونەریتی دواکەوتوانە دەکات، (مازووچنینی لادێ)، کە کۆمەڵە شیعرێکە لە فۆلکلۆر، دڵداری‌و دابونەریتی بەشێك لە خەڵکی ناوچەکە. هەرکام لەو شیعرانە لە سەردەمی خۆیدا، دەمبەدەم لە نێو جەماوەری خەڵکدا، دەگەڕان‌و لە پەروەردەکردنی لاوان، دەوری کاریگەریان دەگێڕا.

مامۆستا قانع کە هەر لە منداڵییەوە، تووشی نەخۆشیی تەنگەنەفەس بووە، لە زینداندا نەخۆشییەکەی بەهۆی ئاووهەوای خراپی ژوورەکانی زیندانەوە، تەشەنە دەکاتو وای لێدێت کە ئیتر بەتەمای خۆی نامێنێت. ئا لەو مەرگە ساتەدا، کە قانع لە زیندان چاوەڕوانی مەرگ دەکات، دلێرانەو بوێرانە شیعری "ئاخرین ماڵی ژیانم" دەهۆنێتەوە.

* قانع سەرەڕای ئەو هەموو نەهامەتی‌و دەردەسەری کۆسپو تەگەرانەی بەردەمی، لە سەرووی هەمووشیانەوە مردنی دایكو باوکی، بەڵام لە منداڵێکی بێدایكو باوکەوە، بووەتە شاعیرێکی گەورەی کوردو لە زۆر بواردا شیعری نووسیوە، لەوانە: ئایینی، دڵداری، نیشتمانی، کۆمەڵایەتی، نەتەوایەتی، شۆڕشگێڕانە.

### ماڵاوایی هەمیشەیی قانعی شاعیر:

قانعی شاعیر دوای بەسەربردنی ژیانێکی لێوانلێو لە دەردەسەری‌و نەهامەتی، دواجار لە ڕۆژی ١٧ی مانگی گوڵان، واتە: ٦ی مانگی مای ساڵی ١٩٦٥، بۆ دواجار ماڵاوایی لە ژیان کردو بۆ هەمیشە چاوەکانی لێك نا، بە مەرگی قانع گەلی کورد یەکێك لە خەمخۆران‌و دڵسۆزان‌و خزمەتکارانی ڕاستەقینەی خۆی لەدەست دا.

قانع ئەو منداڵە بێباوكو دایکەی توانی سەرجەم کۆسپو لەمپەرەکانی ژیانی تێك بشکێنێتو ببێت بە شاعیرێکی گەورەی میللەتەکەی، کە بەدرێژایی مێژوو، نەتەوەکەی شانازی پێوە دەکەن!

سەرچاوە:
https://ckb.wikipedia.org
https://www.kurdclick.net

جەلال عەبدوڵڵا حاجی

# گرفتی ژینگەپارێزی!

پاراستنی ژینگە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە بابەتی وزەوە، چارەسەرکردنی سەرچاوەی وزە بەشێوەیەکی زانستییانە، پێویستییەکە دەبێت ئێستا بکرێت، بەجۆرێك بێت، کار لە ژیانی مرۆڤ نەکات، ئەو چارەسەرە هەنووکەییانەی کە دەکرێن، لە بەکاربردنی وزەدا، کاریگەرییەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەردەکەون بۆ کەسانی پسپۆڕو هەموو خەڵکی، کە دەبێت بەهۆی کارەساتی سرووشتی، لە هەموو گۆی زەویدا بەگشتیو نەهامەتی لە داهاتوودا.

لە دەیەی حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا کۆمەڵەو ڕێکخراوی جۆراوجۆر دەرکەوتن لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، کە گرنگییان دەدا بە گرفتەکانی ژینگەپارێزی لەسەر ئاستی جیهانی؛ بۆئەوەی کارەکانیان هەموو گۆی زەوی بگرێتەوە، پێشتر لە ساڵانی پەنجاکاندا، ئەم کۆمەڵانە لەسەر ئاستی خۆجێی، کاریان دەکرد، بە فشاری تاکەکەسی، کۆمەڵەی بچووك، لەڕێی ڕۆژنامەوەو دواتر گەشەی کرد بۆ کۆمەڵەی گەورەتر، توانییان ڕێنماییەکانیان بچەسپێنن، دواتر بوو بە یاسای یەکلاکەرەوە، کە لەلایەن پەرلەمانەوە دەرچوو، لە پێناو پاراستنی ئاوی ڕووبارو کانیاوەکان، دەریاچە نێوخۆییەکان، هەروەها پاراستنی ئاووهەوای ئەو وڵاتانە – بەتایبەت وڵاتە ئەوروپییەکان- لە پیسبوون، بەم شێوەیە ژیانی پڕ لە ماسیو باڵندەو ڕووەك، گەڕایەوە بۆ ڕووبارەکانو دەوروبەریان، کە پێشتر پیسبوون.

ئەم کۆمەڵانە پێش ئەو ماوەیە نەیاندەتوانی کار بکەن، هەرچەندە لە سنوورێکی تەسکدا کاریان دەکرد، تا جەنگی دووەمی جیهانی، کە لە دەیەی پێنجەمدا کۆتایی هات، وێرانکارییەکی بێشومارو ئابووریەکی داڕووخاوی بۆ ئەوروپا بەجێ هێشت، خەڵکی خەمی سەرەکییان بونیادنانەوەو هەلی کارو پارووەك نان بوو، بەڵام بە باشتربوونی باری ئابووریو بژێوی، ئەو کەسانەی کە گرنگییان بە بواری ژینگە دەدا، بینیان ڕووبارو کانیاوەکان، کەناراوی دەریاکانو ئاوهەوای ناوچەکە پیس بووە، لێرەوە یاسای چالاكو یەکلاکەرەوەیان دەرکرد، بۆ پابەندکردنی پیشەسازی بە کەمکردنەوەو پیسنەکردنی ژینگە، لێرەوە هەندێك لە پیشەسازییە پیسکەرەکان ناچاربوون، کە کارو چالاکییەکانیان بگوازنەوە بۆ وڵاتانی جیهانی سێیەم، ئەم وڵاتانەش بوون بە بەرهەمهێنەرو هەناردەکاری مادە سەرەتاییەکان بە تەنها، دواتر مادەی ناوەنجیو هەندێك جاریش بەرهەمی کۆتایی، ئەمە لە پیشەسازیە پیسکەرەکاندا دەبینرێت وەك پیشەسازی ترشەکانو پەینی کیمیاییو گەلێك پیشەسازی کیمیاوی تر، ئەم گۆڕانکارییەش سوودی بۆ هەردوولا هەبوو، لایەنی ئەوروپی، لە کێشەی پیسبوونی ژینگە ڕزگاری دەبوو، بەهۆی ترشو تفتو گازەترشەکانەوە، کە پێشتر ناچار بوو فڕێی بداتە ئاوەکانییەوە، یان بەبێ چارەسەر بیکاتە ناو هەواوە، ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ تەرکیزکردن لەسەر پیشەسازییە خاوێنەکان. سوودی هەبوو بۆ وڵاتانی جیهانی سێیەم بۆ دەستپێکردنو پەرەپێدانی پیشەسازییەکانی گۆڕین(الصناعات التحويلية)، سەرەتا ئەم کارە هیچ گرفتێکی ژینگەیی درووست نەدەکرد بۆ وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان؛ لەبەرئەوەی ئەم وڵاتانە خاوێنبوون، هەروەها پیشەسازی سنووردرابوو، بەتەنها لە ناوچەی کانەکان کێشەی پیسبوونی ژینگە هەبوو، ئەگەر کێشەیەکیش درووست ببوایە، لەبەرئەوەی کێشە سەرەکییەکە پەیداکردنی پارووەك نان بوو، لەگەڵ هەلی کار گرنگ نەبوو، هەروەها حکومەتیش بەخەڵکەکەی خۆی، پشت گوێ خستبوو، بەدڵنیاییەوە خاوەن پیشەسازییەکانی ڕۆژئاواش، گرنگییان بەخەڵکەکە نەدەدا.

بەتێپەربوونی کات، بڕی مادە پیسکەرەکان زیادیان کرد، بوون بە گرفت بۆخەڵکی وڵاتانی تازە گەشەسەندوو، گەلێك کارەسات ڕووی دا، بوو بەهۆی ژەهراویبوونو کوشتنی هەزاران کەس، لەوڵاتی هندو ئەمریکای لاتینی، دادگاکان لە هەندێکیاندا داوایان لە کۆمپانیا بیانییەکان کرد، قەرەبووی زیانلێکەوتوان بکەنەوە، بەداخەوە زۆر لەو گەلانە، نەیانتوانی کێشەکانیان ببەنە بەر دادگا، بەهۆی کوشتوبڕی حکومەتە دیکتاتۆرییەکانیانەوە، لێرەدا ئاماژە بەیەکێك لەو ڕووداوانە دەکەین:

لەناوبردنی دەڵتای ڕووباری نەیجەر، لەلایەن کۆمپانیای نەوتی(شێڵ)ەوە لە نەیجیریا، نەتەوەی ئۆگۆنی **"Ogoni"**، کە نزیکەی هەزار ساڵە نیشتەجێی ئەو دەڵتایەنو بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵو ڕاو بوو، زەوییەکانیانو کشتوکاڵیانو ئاژەڵەکانیان لەناوچوون، بەهۆی پیسبوونی ژینگەوە، لە ئەنجامی هەڵکەندنی بیری نەوتەوە لە دەڵتاکەدا، ئەمە وای کرد دانیشتوانی ناوچەکە خۆیان کۆ بکەنەوە، نارەزایی دەرببڕن لە بەرامبەر کۆمپانیای (شێڵ)، بە پێشەوایەتی نووسەری بەناوبانگی نەیجیری (کین سارۆویڤوا **Ken Saro-wivwa**)، سەر بە هۆزی ئۆگۆنی بوو، ڕێکخراوەکانی بواری ژینگەو مرۆڤدۆستەکان لە ئەوروپاو ئەمریکا یارمەتیو بانگەشەیان بۆ کرد، دەنگێکی گەورەی دایەوە، بەڵام دیکتاتۆری ئەوکاتەی نەیجیریا (ژەنراڵ سانی ئەباشا)، توانی کەشێکی لەبار بۆ کۆمپانیاکەو ئەوانی تریش بڕەخسێنێت، بە لە سێدارەدانی ئەو نووسەرەو هەشت لە هاوڕێ چالاکەکانی لە بواری ژینگە پارێزیدا، لە ١٠-١١-١٩٩٥.

**سەرچاوە:** کتێبی: (حل مشكلة الطاقة هو التحدي الأكبر للبشرية في القرن الحادي والعشرين!! – فؤاد قاسم الأمير)




# عبدالرحمن جريسي (١٩٣٢ - ....)

**خاوەنکاری مەزن عبدالرحمن جريسي:**

ئەم منداڵە بێباوکە، هاوکات بێئەوەی دەرچووی زانکۆ، یان پەیمانگایەك بێت، چۆن توانی دامەزراوەیەکی ئابووریو خانوبەرەی وەها دابمەزرێنێت، کە پێشبڕکێی بازاڕەکانی پێ بکات؟

چۆن توانی ئیمپراتۆریەتێکی دارایی کە لە ئامێری کارەباییەوە؛ تا کەلوپەلی ناوماڵو خانوبەرەو گەیشتن بە بانکەکان دابمەزرێنێت؟

عبدالرحمن جریسی، ژیانی لێوانلێو بووە لە دەستکەوتو بەرهەمی ناوازە، کە شایستەی ئەوەیە بخوێنرێتەوە؛ بۆئەوەی سوودی لێ ببینرێت، ئەم پیاوە واتە: دەریایەك لە ئارامیو هیوا، کە هیچ سنوورێك ناناسێت!

عبدالرحمن جریسی، لە شارۆچکەی رەغبە نزیك (المحمل) ساڵی ١٣٥١ کۆچی، بەرامبەر ١٩٣٢ زاینی لەدایکبووە، تەمەنی دووساڵان بوو، باوکی کۆچی دوایی کردو باپیری بەخێوکردنی لەئەستۆ گرتووە، لە تەمەنی هەشت ساڵاندا، دەچێت بۆ پایتەخت؛ بۆئەوەی لەلای مامی (محمد ئەلجریسی) درێژە بە ژیانو خوێندن بدات..

لە پایتەخت نێردرایە قوتابخانە، بەڵام لەبەر هەر هۆکارێك بێت، نەیتوانی درێژە بە خوێندن بدات، لە پێنجی سەرەتایی دەستی لە خوێندن هەڵگرتو رووی کردە بازاڕی کارکردن، هەرچەندە وازهێنان لە خوێندن نەبووە بەربەست لەبەردەمیدا بۆ پەرەپێدانی خودو زیادکردنی زانستو زانیاری، بەڵکو توانی لە رێگەی خولی فێرکارییەوە لە بواری بەڕێوەبردنی کارو ژمێریاری، شارەزایی باش دەست بخات، هاوکات بەشداری دوو خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزیو ئیتاڵی کرد.

سەرەتای کارکردنی عبدالرحمن جریسی، لە تەمەنی چواردەساڵییەوە دەستی پێ کرد، لە یەکەم کاریدا، بووە بە شاگردی فرۆشگەیەکی بازرگانی لە ریاز، کە رۆژانە تەنها شەش دۆلاری وەردەگرت، عبدالرحمن جریسی گوێی بە کەمی کرێکەی نەدەدا، زۆر بە دڵسۆزانە کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد، ماوەی یانزە ساڵ لەو فرۆشگە بازرگانییەدا بەردەوام بوو، بە هۆی لێهاتوویی و دڵسۆزیو خۆشەویستی بۆ کارەکەی، بوو بە بەڕێوەبەری فرۆشگەکە، تا دواجار مووچەی مانگانەکەی بووە زیاتر لە ١٣٠٠ دۆلار!

ساڵی ١٣٧٨ك سەرەتای دەرکەوتنی توانا شاراوە راستەقینەکانی عبدالرحمن جریسی بوو، لەو ساڵەدا دامەزراوەیەکی بەناونیشانی (بيت الرياض) درووست کرد، بۆ فرۆشتنی کەلوپەلی ناوماڵ، بە هاوبەشی بازرگانێکی هاوڕێی، هەرچەندە ئەم دامەزراوەیە سەرەتا بە دەست زەرەرو زیانەوە دەیناڵاند، بەڵام دواجار عبدالرحمن جریسی توانی ئەو زیانانە بگۆڕێت بۆ قازانجو سەرکەوتنو دەستکەوت، بە تایبەت لە ساڵی ١٣٨٢ك کاتێك کۆمپانیاکە بە تەواوی بووە موڵکی خۆیو بەشی بازرگانەکەی هاوڕێی کڕییەوە، ئەلجریسی لەم ئەزموونەوە فێربوو، کە چۆن بەسەر کۆسپو تەگەرەکانی ژیاندا سەر بکەوێتو رووبەڕوویان ببێتەوەو هەرگیز خۆی نەدات بەدەست شکستەوە!

دوای ئەوە عبدالرحمن الجريسي بە فەزڵی خودا، توانی زنجیرەیەك سەرکەوتنی یەك لە دوای یەك لە کارەکەیدا بەدەست

بهێنێت، له ساڵی ١٤١٣ کۆچی، دهستی کرد به دامهزراندنی زیاتر لــه یازده کۆمپانیا، دوای فرانبوونی کۆمپانیای (بیت الرياض) هەروەهــا چوونــە نێــو کاری ئەلەکترۆنیــاتو تەکنەلۆجیاو کۆمپیوتەرو کەلوپەلی فوتابخانە، کە ســەرجەمیان بەرهەمی خۆماڵــی وڵاتەکەی خۆی بــوون، هەروەهــا کۆمپانیای دایکی دامەزراند، کە ئێســتا لە زۆرێك لە شــارەکانی وڵاتەکەی لقی هەیــە، هەروەهــا دوو کۆمپانیــای دیکەی لــە قوبرس هەیە، کــە لە هەمــان بواری تایبەت بــە کۆمپانیاکانــی کار دەکات، کۆمپانیایەکــی دیکــەی هەیە، لە بواری کەلوپەلی پزیشــکیدا کار دەکات، هــاوکات لە وڵاتی کوەیــت، کۆمپانیایەکی بەناوی (کۆمپانیای ئەلجریسی بۆ کەلوپەلی فوتابخانە)هەیە، کە ئەم کۆمپانیایــە ٣٠٠ وەکالەتــی بازرگانی بــۆ کۆمپانیا جیهانییە گــەورەکان دابین کردووە، کە لە بواری کۆمپیوتەرو کەلوپەلو پێداویستییەکانی فوتابخانەدا کار دەکەن.

* عبدالرحمن جریســی پشــکی گەورەی هەیە لە زۆرێك لە ژوورە بازرگانییەکانو شارە پیشەسازیو بازرگانییەکان، هەروەها خاوەنی چەندین لیژنەو نوێنەرانی خێرخوازییە.

* عبدالرحمن جریســی لە ســاڵی ١٤٣١کۆچییــەوە، بووە بە ســەرۆکی گرووپی کۆمپانیــاکانو دامــەزراوەکانو کارخانەکانی ئەلجریســیە، هــاوکات ســەرۆکی ئەنجوومەنــی بەڕێوەبردنی ژووری بازرگانــیو پیشەســازیی شــاری ڕیاز بــووە، هەروەها ســەرۆکایەتیو ئەندامێتیــی زۆرێك لە لیژنەکانــی بانکەکانو ژوورە بازرگانییــەکانو کۆمپانیــاکانو دامــەزراوە بازرگانــیو خێرخوازییەکانی ناوخۆو دەرەوەیە.

* لــە بواری پەروەردەدا، هاوکارییەکی زۆری پێشــکەش بە دامەزراوە فەلەســتینییەکان کردووە، هەروەهــا بری تێچوونو ئامادەکردنــی دروســتکردنی کۆلێژی بازرگانــیو ئابووری لە زانکۆی بەیروت گرتۆتە ئەســتۆی خۆی، کە لە ســاڵی ١٩٩٣ بۆ یەکەم جار کرایەوە، لە زۆر بواری دیکەدا، دەستی باڵای هەبووە بەتایبەت لە بوارە خێرخوازییەکاندا!

**چەند ڕاستییەك لە بارەی عبدالرحمن جریسی:**

* خەڵاتی مەلیك عەبدولعەزیزی بە پلەی یەکەم وەرگرتووە.

* عبدالرحمن جریسی بە خاوەنی یەکەم دامەزراوە دەژمێردرێت، بۆ کۆمپیوتەرو پێداویستییەکانی لە ناوخۆی وڵاتەکەیدا.

* سەروەتەکەی ئێستای بە دوو ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێت.

* بووە بە براوەی یەکەمی هەڵبژاردنی ئابووری بۆ دیارترین پیاوانی خاوەنکار، لە ناوخۆی وڵات لە ساڵی ١٩٩٥.

* لە ســاڵی ٢٠٠٠دا زانکۆی (کینزنگتۆن یونیفرســتی اوف هاوای اند کالیفورنیا) بڕوانامەی دکتورای فەخریيان پێبەخشی، لــە بــواری فەلســەفەی ئابووریدا، وەکو ڕێزێك بۆ ئەو پشــکە زۆرەی لە بواری مرۆڤایەتیو زانســتیو ڕۆشــنبیریو ناوخۆیو جیهانی پێشکەشی کردووە.

* بڕوانامەی شــەرەفی لە فەلسەفەی بەڕێوەبردنی کاردا، لە زانکۆی ئەمریکا لە ویلایەتی مونتانا پێ بەخشراوە.

* خەڵاتی دامەزراوەی جیهانیی ئەمریکی بۆ هەڵسەنگاندنی دەســتکەوتەکانی لــوس ئەنجلوســی لــە زانکــۆی کالیفۆرنیا پێ بەخشراوە.

* خەڵاتــی دامەزراوەی ئیســلامیی (محمد)ی بۆ کەســێتیی جیهانی ئیســلامی لە ساڵی ٢٠٠٠ لە شیکاگۆ لە ویلایەتی ئیلوینز پێ بەخشراوە.

* بــە پلەی کوماندۆز، مەدالیای بــەرزی بەلجیکای لەلایەن فەرمانڕەوای بەلجیکی: ئەمیر فیلیب پێ بەخشراوە.

* لەلایــەن پەیمانگایەکــی ئەمریکییەوە، لە ســاڵی ٢٠٠٤ بۆ پیــاوی ســاڵ هەڵبژێــردراوە. American Biographical Institute

* عبدالرحمن جریســی نیشــانەو مەدالیای (ئیبن ســینا)ی پێبەخشــرا لە کۆماری ڕووســیای یەکگرتوو، هاوکات هەڵبژێردرا بــۆ ئەندامێتی لە ئەکادیمیای ڕووســی بۆ زانیــاری کۆمەڵایەتی گشتی، هەروەها کۆششی زۆری کردووە لە بواری پەیوەندییەکانی کەرتــی کاروباری بازرگانی ئەو دوو وڵاتە، ئەم پلەیەش لەســەر ئاستی ناوخۆو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یەکەم کەسێتییە کە ئەو ئەندامێتییەی وەرگرتبێت، بــەم بۆنەیەوە ژووری بازرگانیو پیشەســازی ڕیاز، بە ئامادەبوونی دەســتەی بژاردەی پیاوانی کار لــە ئەندامانی بواری دیبلۆماســی کە نوێنەری باڵیۆزی ڕووســیا پێشکەشی کردبوون، ئاهەنگێکی ساز کرد.

**عبدالرحمن جريسی ئێستا:**

*سەرۆکی بەڕێوەبردنی گرووپی کۆمپانیاکانی(ئەلجریسی)ە.

* سەرۆکی ئەنجوومەنی کارەکانی سعوودی یابانییە.

* سەرۆکی ئەنجوومەنی کارەکانی سعوودی چینییە.

* ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی هێڵی ئاسمانی وڵاتی سعودیەیە.

*ئەندامی دەزگای باڵایە بۆ پەرەپێدانو گەشەسەندنی شاری ڕیاز.

* سەرۆکی ئەنجوومەنی کارەکانی سعوودی ئەمریکییە.

لەگەڵ چەندین پۆستی دیکە کە لە ڕابوردوودا هەیبووە، یان ئێستا بووەتە خاوەنی ئەو پۆستانە..

**لە کۆتاییدا:**

عبدالرحمن جریســی لە شاگردی فرۆشگەیەکی بازرگانییەوە توانــی ئیمپراتۆریەتێکــی بازرگانــی دابمەزرێنێــت، کە نزیکەی پێنج هــەزار کارمەندی هەیە، هەروەها بە یەکێك لە گرنگترین پایەکانــی ئابووری وڵاتی ســعوودیە دەژمێردرێــت، عبدالرحمن جریســی ئەو کەســەی مووچەی مانگانەکەی تەنها شــەش دۆلار بوو، ئێستا خاوەنی دوو ملیار دۆلارە.

عبدالرحمن جریســی توانی شکســت بگۆڕێت بە سەرکەوتن، زیــان بگۆڕێت بــە قازانج، بێگومــان بە پشــتیوانیو یارمەتیی خودا، پاشان بە ســووربوونی لە بڕیاردانی درووستو بەردەوامی لە کارەکەیدا، وەرگرتنی پەند لە شکســتەکانیو گۆڕینی ڕێڕەوی شکست بەرەو سەرکەوتن، بێگومان ناڕەحەتییەکانی ژیان هەڵێکن بۆ گەیشتن بە لوتکە!

سەرچاوە: https://ar.wikipedia.org

کتاب/ عظماء بلا مدارس



نووسینی: شێنێ والی

# شەونخوونی لە سەدەی بیستو یەكدا

لە ئێستادا دیاردەیەكی ناتەندرووست لەناو كۆمەڵگەكەماندا بڵاوبووەتەوە، ئەویش نەخەوتن بە شەوداو خەوتن بە ڕۆژ، كە دەبێت بەهۆی زیانگەیاندن بە تەندرووستی مرۆڤو ماندوبوونی مێشكو هزر، لە كاتێكدا مێشكمان وەك پڵیتەی چرایەك وایە، كە پێویستی بە سوتەمەنییە بۆ چالاكبوون تاكو وزەی پێنەبەخشی ناتوانێت هەڵبستێت بە ڕووناككردنەوەی خۆی، پاشان دەوروبەر، گەر ڕووناكی زیاتری پێببەخشیو سوتەمەنییەكی خاوێنتری بۆ بەكار بهێنیت، تەنانەت توانای گەرمكردنیشی بۆ درووست دەبێت، وەك ئێمە گەر وزەكانمان بۆ نەگەڕێتەوە، شەوانە مێشكیش ناتوانێت گرنگی بە تەندرووستیو چالاكییەكانمان بدات، ئەوا ئەندامەكانی جەستەمان لاواز دەبن لە كاركردن، ئەم نووستنە هەڵەیە هۆكاریشە بۆ لە دەستدانی كاتێكی زۆرمانو هەستكردن بە بارگرانیو تووڕەبوون لەخۆڕا، لەدەستدانی خەندەكان جگە لەوانەش تێكچوونی ڕوخسارەكان بە ڕەشبوونی ژێر چاوەكانو هەڵئاوسانی پێڵوەكان.

توێژینەوەیەك ئەوەی سەلماندووە كە كەمخەوی دەبێت بەهۆی گۆڕانكاری لە بۆهێڵەكانی جەستەی مرۆڤداو هاوكات بە هۆی تێكچونی بۆهێڵەكانەوە، ئەگەری تووشبوون بەنەخۆشی (شەكرە) لە جۆری دووەم زیاد دەكات، دەبێت بەهۆی قەڵەوی. خودای گەورە مێشكی وا خوڵقاندووە، كە ماندوێتی ڕۆژ بە خەوی شەوان دەربكات كاتێك كە چاوەكان لێك دەنێین لە تاریكاییدا خانەكانی مێشك دەست بە پشوودان دەكەن، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًا ﴾ یونس: ٦٧

واتە: هەر زاتی خودایە شەوی بۆ بەدی هێناون؛ بۆئەوەی تێیدا بحەوێنەوەو ڕۆژیشی بۆ ڕووناك كردوونەتەوە (تاوەكو كارو فرمانی تێدا ئەنجام بدەن).

هەموو مرۆڤێكی ئاسایی پێویستە ڕۆژانە شەش تا هەشت كاتژمێر بنوێت، گەر ئەم ماوەیە تەواو نەكرێت؛ ئەوا ئەگەری كەوتنەوەی ڕوداوە نەخوازراوەكانی زۆرتر لێدەكەوێتەوە، زۆرجار بەهۆی بوونی كارەوە، ناتوانین بە ڕۆژ قەرەبووی نەخەوتنەكەمان بكەینەوە، دەبێت كارو چالاكییەكانی ڕۆژانەمان بەجێ بگەیەنین، دووبارە ئەمەش زیانی هەیە؛ چونكە ناچارین بەو خەواڵوییە بچینە ناو كۆمەڵگەو كار ڕاپەڕێنین، توێژینەوەیەكی ئەمریكی دەری خستووە: ساڵانە لە جیهاندا سەد هەزار ڕوداوی هاتوچۆ ڕوودەدات، كە هۆكارەكەی كەمخەوییەو ئەو كەسانە لە كاتی شۆفێریدا خەویان هاتووەو شەو نەنووستون.

ئەم دیاردەیە تا چەند ساڵێك لەمەوبەر تەنها گەنجانی گرتبووەوە، بەڵام ئێستا لە ناو بە تەمەنو گەورەكانیشدا بووە بە باو. هۆكاری ئەم لێتێكچونەش زیاتر بەكارهێنانی ئینتەرنێتو تۆڕەكۆمەڵایەتییەكانو سەیركردنی دراماو... هتد، كە بوون بەهۆی نەمانی پەیوەندیی كۆمەڵایەتیو تەنانەت وامان لێهاتووە لە بۆنە ئاینیو كۆمەڵایەتییەكانیشدا، سیلەی ڕەحم زیندوو ناكەینەوەو سەردانی دۆستەكانمان ناكەین، سەروەری مرۆڤایەتی لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: (أَيّهَا النَاسُ ، أَفْشُوا السَّلامَ ، وَأَطْعِمُوا الطَعَامَ ، وَصِلُوا الأَرْحَامَ ، وَصَلُوا بِاللَّيْلِ وَالنَاسُ نِيَامٌ ، تَدْخُلُوا الجَنَةَ بِسَلامٍ) واتە: ئەی خەڵكینە، سەلام لەیەكتری بكەن، نانی هەژار بدەنو پەیوەندیی خزمایەتی مەبچڕنو شەو لەكاتێكدا خەڵكی نووستوون نوێژو نزا بكەن، دەچنە بەهەشتەوە بەسەلامەتیو دوور لە نارەحەتی.

دەشفەرمووێ ناچێتە بەهەشتەوە ئەوەی سیلەی ڕەحم بەجێ نەهێنێت، دە با هەمووومان پەیوەندییەكانمان توند بكەینەوەو بۆ بەدەستهێنانی بەهەشتی بەرین، بێگومان بە ڕێككردنەوەی كاتەكانمان، دەتوانین هەموو كارێك بە ئەنجام بگەیەنین.



# ئاشكراكردنی نهێنی

و: زریان مەحموود

لە گوندێکی دورەدەستدا دوو هاوڕێ دەژیان، یەکێکیان ناوی جۆنسۆنو ئەوی تریان ناوی پیتەر بوو، ئەم دوو هاوڕێیە لە منداڵییەوە بەیەکەوە گەورە بووبوون، پەیوەندییان ئەوەندە باش بوو بەیەکەوە کە زۆرینەی خەڵکی گوندەکە وایان دەزانی برای یەکترین. ئەگەرچی هیچ لە یەکتریشیان نەدەکرد، بەڵام ئەو بۆچونەی خەڵکی گوند لوتکەی موحیببەتو خۆشەویستی ئەو دوو هاوڕێیەی نیشان دەدا.

هەمیشە جۆنسۆنو پیتەر نهێنییەکانی خۆیان لای یەکتری باس دەکردو لە کاتی کێشەو گرفتەکانیاندا ڕاوێژیان بەیەکتری دەکرد، هەتا لەکۆتاییدا ڕێگەچارەیەکیان دەدۆزییەوە. بەڵام زۆرینەی کات جۆنسۆن بەبێئەوەی کە پیتەر بزانێت ئەم بابەتانەی بۆ خەڵکی تر باس دەکرد.

کاتێك کە پیتەر بەم کارەی جۆنسۆنی دەزانی، زۆر نیگەران دەبوو، بەڵام نەیدەدایەوە لە ڕوی جۆنسۆن. لە بەرئەوەی کە ئەوەندە جۆنسۆنی خۆش دەویست، ئامادە نەبوو کە بەهۆی هیچ شتێکەوە بۆ ماوەی خولەکێکیش بێت هیچ کێشەیەك بکەوێتە نێوانیانەوە. لەبەرئەوە هەر ڕێزی جۆنسۆنی دەپاراستو دیسانەوە دەردەدڵی لەلا دەکردەوە.

ساڵان تێپەڕینو پیتەر هاوسەرگیری کردو ڕۆشتە سەر ماڵو ژیانی خۆی. بەڵام پەیوەندییەکەیان هەر بەردەوام بوو ڕۆژبەڕۆژیش قووڵتر دەبوو. ڕۆژێکیان پیتەر بۆ ئەنجامدانی کارێکی زۆر گرنگ دەیویست لەگەڵ خێزانەکەیدا بڕوات بۆ شار. لە بەرئەوە ڕۆیشت بۆ لای جۆنسۆنو وتی من دەمەوێت بڕۆم بۆ شار، بەڵام ئەگەر دەتوانیت ئەم کیسە پارەیە لەماڵی خۆتان هەلگرە هەتا لە شار دەگەڕێمەوە.

جۆنسۆنیش پارەکەی وەرگرتو هەتا دەرگای دەرەوە خواحافیزی لە پیتەری هاوڕێی کرد. دواتر جۆنسۆن ڕۆیشتە دەرەوە بۆ لای هاوڕێکانی تری...دونیا وردەوردە خەریك بوو تاریك دەبوو، ئیتر جۆنسۆن ویستی بڕواتەوە بۆ ماڵەوەو خواحافیزی لە هاوڕێکانی بکات. بەڵام هاوڕێکانی پێیان وت هێشتا زووە بۆچی وەکو شەوانی تر ناڕۆیت؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی کە پارەکانی پیتەری هاوڕێی لەماڵی ئەوانەو پێویستە زوو بڕواتەوەو چاودێرییان بکات...بە کورتی جۆنسۆن خواحافیزی کردو ڕۆیشت. کاتێك گەیشتە ماڵەوە خێرا نانی خواردو ڕۆیشت بۆ ژورەکەی خۆی. پارەکانی خستنە ناو سندوقێکەوەو نووست. بێ ئاگا لەو ڕوداوەی کە لە چاوەڕوانیدا بوو.

بەڵێ، لە جێگای خۆیدا گومانتان کرد. چەند کەسێك لەهاوڕێکانیی ڕۆشتنە ماڵی جۆنسۆنو پارەکانیان دزی! جۆنسۆن کە بەیانی لە خەو هەستاو بەو ڕوداوەی زانی، لە ناڕەحەتیدا خەریك بو سەکتە لێی بدات. ئەگەر هەموو بوونو نەبوونی خۆی بفرۆشتایە هەر نەیدەتوانی قەرەبووی پارە دزراوەکانی پیتەر بکاتەوە.

ئێوارە کاتێك پیتەر لە شار گەڕایەوە، هات بۆلای جۆنسۆن بۆ وەرگرتنەوەی پارەکانی. کاتێك جۆنسن ڕوداوەکەی بۆ گیڕایەوە پیتەر لە بری ئەوەی کە تووڕە ببێت دەستی بە پێکەنین کردو وتی دەمزانی، دەمزانی کە دیسان وەکو هەمیشە ناتوانیت زمانت بگریو لای هەموو کەس باسی دەکەیت کە ئەو پارانەی منت لەلایە. بەڵام نیگەران مەبەو مەترسە. چونکە من پێشتر حسابم بۆ ئەوەکردووە کە ئەم ڕوداوە ڕوبدات. هەر لەبەرئەوە چەند سکەیەکی ئاسنم کردە ناو ئەو کیسەیەوە کە هێنام بۆ تۆو پارەکانم لە ماڵی خۆمان هەلگرتن، چونکە دەمزانی تۆ ئەم بابەتە باس دەکەیتو هەموو خەڵك دەزانێت کە من پارەکانم هێناوەتە لای تۆ. بەوەش ئەوەی نیازی دزی بوبێت بۆ ماڵی تۆ دێتو ماڵەکەی من پارێزراو دەبێت. ئێستاش نیگەرانو ناڕەحەت مەبە، لەوانەشە ئەم ڕەفتارەی من جێگەی دلگرانیشت بێت. بەڵام ئەمە وانەیەك بوو بۆ تۆ، کە هەمیشە ئەو بابەتانەی کە بۆت باس دەکرێن لەناو دڵی خۆتدا بیان پارێزیتو لەگەڵ کەسێکی متمانە پێنەکراو نهێنی دڵت باس نەکەیت.

بەم جۆرە پیتەر بە زانایی خۆی توانیی پارەکانی لە دزرانو هاوڕێیەتیە پتەوەکەشی لە تێکچونو پچڕان بپارێزێت.



# لە مێژووەوە فێرنەبووین!

سەودا مەهدی

* لە مێژووەوە فێرنەبووین.. کە ئەو ڕووداو کێشانەی کە ڕوویانداوە دووبارەدەبنەوەو هەمان ڕێگا دەگرینەوەبەرو هەڵەکان دووبارە دەکەینەوەو ڕێگا چارەیەك نادۆزینەوە...

* لە مێژووەوە فێرنەبووین.. کە شکستی زۆربەی جەنگەکان بەهۆی خیانەتی هەندێك کەسەوەبووە کەبوەتە هۆی لەناوبردنی چەندەها کەس...

* لە مێژووەوە فێرنەبووین.. کە نەهێڵین(سەفەر بەلەك) ێکی تر دووبارەنەبێتەوە...

* فێرنەبووین.. کە هۆکاری پێش نەکەوتنمان جەنگی بەردەوامە...

* فێرنەبووین.. کە بەرێکەوتن چەندین ساڵ جەنگ ڕادەگیرێت...

* مێژوومان لەبیر کرد کەبزانین وڵاتی ئێمە سەرچاوەیی هەموو عیلمو ئەدەبو ئاینێك بووەو خاوەنی کەلتورو ڕۆشنبیری جیاوازی خۆی بووەو خاوەنی چەندین شاعیرو کەڵە پیاوی نەبەردو ئازابووەو خاوەنی داستانە گەورەکانی قارەمانیو خۆشەویستیو وەفا بووە.

* مێژوومان لەبیرکرد کە چەندین گەنجو پیرو منداڵو چەندین کەسی ناوداری گەلەکەمان خۆیان فیداکرد لەپێناوی یەکرێزی کوردو ئازادیدا، لەبیرمان کرد کە دەبێت ئێمەش درێژە پێدەری ئەو ڕێگایەبین کە ئەوان دەستیان پێکردووە...

لەبیرمان کرد کە کورد ناحەزی زۆرەو دەبێت هەموو بەیەکەوە بین بۆ تێکشکاندنیان، هەموومان ئەو چیرۆکەمان چەندەها جار بیستووە، بەڵام بەداخەوە لێی تێنەگەیشتووین کاتێك کە باوکێکی پیر کورەکانی بانگ دەکاتو هەریەکەو چیلکەیەکیان دەداتە دەست تا بیشکێنن، پاشان دواتر هەموو چیلکەکان بەیەکەوە دەیداتە دەستیان بۆئەوەیی بیشکێنن، بەڵام ناتوانن، ئەمە وانەیەکی فێری کوڕەکانی کرد تا فێری گرنگی یەکگرتوویو یەکرێزیی بنو پیشانیان بدات کە ئەوانیش ئەگەر یەکڕیزبن ئەوا وەك کۆمەڵە چیلکەکە ناتوانرێت بشکێنرێنو دەبن بەپۆڵا لە بەرامبەر دوژمناندا...

* لە مێژووەوە فێری خۆراگریی نەبووین، فێری بینینی هەستی نیشتیمانی نەبووین، فێری یەکرێزیو یەکدەنگیو تەبایی نەبووین، ئەمانەش بە هۆی چەندین جەنگەوە کە هەر جەنگەو کلتورو هەستێکی لەناوبرد جەنگی تەکنەلۆجیاو مۆبایلو... جەنگی فیلمە بیانییەکانو گەشتکردن بۆ ئەوروپاو جەنگی ناردنی جەرگی دایکانمانو ناردنی باوکی ڕۆڵە چاو لەدەستەکانو کوشتنی لاوە بێ نازەکانیوڵاتو شانازی سەرکەوتنیشیان بۆ کاربەدەستەکانمان...

* لە مێژووەوە تەنها یەك شتمان بۆ ماوەتەوە ئەویش ناوی کوردو موسڵمانبوونمانە لەسەر ڕەگەزنامەکان، کە ئەویش بە تەواوەتی کاڵ بووەتەوەو خەریکە بە تەواوەتی لە ناودەچن...



و: رابەر ئەحمەد وەرتی

# 23 ڕێگای دەربڕینی خۆشەویستی بۆ هاوسەرەکەت لە ڕێگای مۆبایلەکەتەوە

وەك هەر شتێك، تەكنەلۆژیاش دەكرێت بە باش، یان بە خراپ بەكاربهێنرێت. ئێمە لێرەدا ٢٣ ڕێگا بۆ ئافرەتان پێشنیار دەكەین، كە لە ڕێگەی مۆبایلەوە دەتوانرێت خۆشەویستی بۆ هاوسەرەكانیان زیاتر پیشان بدەن.

هەر ئەمڕۆ هەوڵی یەكێك لەم ڕێگایانە بدەو بزانە هاوسەرەكەشت چۆن وەڵام دەداتەوە.

١- چاوەڕێ بكە هەتا لەو ژوورەیت كە ئەویشی لێیە، جا دەقی «من تۆم خۆش دەوێ»ی بۆ بنێرە.

٢- بە یەكەوە سەیری ڤیدیۆیەكی كۆمیدی نێو یوتیوب بكەن.

٣- ئەو ئەپلیكەیشنە بدۆزنەوە كە خۆتو مێردەكەت پێكەوە دەتوانن ئەنجامی بدەن.

٤- ڤیدیۆیەكی خۆتی بۆ بنێرە كە تیایدا دەڵێی «بەیانیت باش ئەزیزم».

٥- ساڵنامە بەكاربهێنە. بۆ بیرخستنەوەی ئەوەی ئیمەیڵێك، یان تێكستێكی خۆشی بۆ بنێری.

٦- بە مۆبایلەكەت وێنەیەكی بگرەو لەسەر شاشەكەی دابنێ.

٧- یەكەمین میوزیكی نێو ڤیدیۆی ئاهەنگی هاوسەرگیریتان لێ بدەو گوێی لێ بگرە.

٨- با كەڤەری مۆبایلەكەت بە دڵی ئەو بێت.

٩- هەڵبژاردنی میوزیكی زەنگی مۆبایلەكەت لای ئەو بێت، میوزیكێك نەبێت حەزی پێ نەكات بە كەمو زۆر.

١٠- دەقێكی كورتی دوعای بۆ بنێرە كە بۆی دەكەیت.

١١- ئەگەر تەلەفۆنێكی ژمارە نەناسراوت بۆ هات، هەڵی مەگرەو بیدە بەو جوابی بداتەوە.

١٢- ڕۆژانەی پێكەوە ئەپلیكەیشنی قورئان بەكاربهێننو قورئانی تیادا بخوێننەوە.

١٣- ئەو گۆرانییەی كە لای ئەو دڵخوازو هەڵبژاردەیە، لەنێو مۆبایلەكەت لێی بدەو بۆشی بلێرەوە.

١٤- گەر پەیوەندیت پێوەكرد، ئەویش ڕەتی كردەوە كە ڕەنگە بەهۆی كات نەگونجاوی بێت.. دووبارەی مەكەرەوە، خۆ ئەگەر زۆر گرنگ بوو، نامەیەكی بۆ بنێرە.

١٥- كە لەگەڵ منداڵان یاری دەكات، وێنەیەكی بگرەو لە ئینستاگرام، یان فەیسبووك بڵاوی بكەرەوە.

١٦- با مۆبایلەكەت ژمارە نهێنی لەسەر بێتو هاوسەرەكەت بیزانێت.

١٧- هاوڕێیەكت هەبێت كە خۆی بە بەرپرسیار بزانێت لەو چالاكیانەی لە نێو مۆبایلەكەتدا هەیە.

١٨- ناردنی تێكستێكی خۆشەویستی بە فەیسبووك.

١٩- هەندێجار لە ماوەی نانخواردنی نیوەڕۆیدا تەلەفۆنی بۆ بكەو پێی بڵێ كە چەندەت خۆش دەوێ.

٢٠- بەرواری ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی بۆ بنێرە كە لە ماوەی دەستگیرانداریدا دیدارتان تیایدا هەبووە، هەندێ نیشانەشی پێ بڵێ تا زوو ڕۆژەكەی بێتەوە یاد.

٢١- وێنەیەكی كۆنی سۆزداری بۆ بنێرە، لەگەڵ نامەیەكی خۆشو شیرین.

٢٢- شتێك بە خەتی خۆت بنووسەو پاشان وێنەیەكی بگرەو بۆی بنێرە.

٢٣- گرافیكێك، یان وێنەیەكی جوان، كۆمیدی یانیش دڵدارانە بدۆزەرەوەو بۆی ڕەوانە بكە.

هەوڵی هەر یەك لەم ٢٣ ڕێگایە بدە، لە ٢٣ ڕۆژانی داهاتوودا، جا دواتریش ببینە بزانە هاوسەرەكەت چۆن وەڵام دەداتەوە!



و: ئاسوودە هیدایەت

# وێنەکان یادگارینو دەمێننەوە

پێویستە زۆر شت فێری منداڵەکان بکەین، ڕەنگە منداڵەکان، تا ماوەیەکی زۆر هەست بە زۆرشت نەکەن، بەڵام ئەرکی گەورەکان هەموو کات ئەوەیە: لەگەڵ ئەواندا هاوڕێ بن، تا فێر ببن هاوشێوەی من (دایك) کە بۆ فێربوونی منداڵەکانم، هەمیشە هەوڵم داوەو نیگەرانم کە لە فێربوونی وانەکانی ژیان دوور بکەونەوە، پێویستە هەندێك لە شتەکانیش، زۆر لەسەرخۆو ئارامو لەمەودای دوورو درێژدا فێریان بکەین.

فێربوونی هەندێك شتیش نەستییە، بۆ نموونە: وەکو فێربوونی یادەوەریی درووستکردن، من نەمدەویست دابنیشمو بەمنداڵەکانم بڵێم، کە دەبێت بیرەوەریتان هەبێتو بۆ بیرەوەرییەکانیش ڕێز دابنێنو ئەو شتانە بۆ خۆیان بپارێزن؛ چونکە یادەوەری بەشێکە لە خودی مرۆڤ، ناشتوانن نکوڵی لەوە بکەن، من تەنها دەمویست لەگەڵ ئەواندا، وێنەیەکی خێزانی بگرم، ئەو وێنەیەش لەلای وێنەکانی ترمدا هەڵبگرم، بەڵام منداڵەکان خۆیان دەرگای باسەکەیان کردەوەو بابەتەکە لەو شوێنەوە دەستی پێ کرد، کە نازەنین بەبێتاقەتی گوتی: بۆچی دەبێت وێنەبگرین، من گوتم وێنە شتێکی باشە، نیما کە شتێکی بیستبوو، گوتی: دەڵێن وێنە بە یادگاری دەمێنێتەوە، نازەنین کە هەر بەوشێوەیە بەبێتاقەتی دانیشتبوو، هەموویان چاوەڕێی هاتنی بوون، کە بێتە جێگا خاڵییەکەی خۆی، لەناو وێنەکەدا گوتی: من یەك دونیا لەم یادەوەرییانەم هەیە، کە دایکم هەر لەمنداڵییەوە پێی گوتووم کە دەستکارییان نەکەمو بەیادگاری بیانپارێزم، من بەسەرسوڕمانەوە سەیرم کردو ئەویش بەردەوامبوو لە قسەکانیو گوتی: تۆقەیەکی قژ کە لە باخچەی ساوایان بە دیاری وەرم گرتبوو، هەموو کات حەزم دەکرد، بەکاری بهێنم، تۆ گوتت: دەبێت بە یادەوەری بمێنێتەوە، بووکەڵەیەکیش، کە پوورم لە تەمەنی پێنجساڵیمدا پێی دابووم، هێشتا لەناوپاکەتەکەیەتی لەسەردۆڵابەکە، ئەو کراسەی کە مامەگیانم لەسەفەر بۆی هێنابووم، ئەوەندە لەبەرت نەکردم تاوەکو بچووك بووەوە، نازەنین کە ئەم قسانەی کرد، ئازادیش سەری دەردەدڵەکانی کرایەوەو بەپەرۆشەوە پشتگیری قسەکانی ئەوی کردو گوتی: منیش لەم بیرەوەرییانەم زۆر هەیە، وەکو ئەو سەیارە فورمیشەی کە لەیەك ساڵیدا، بەدیاری وەرم گرتبوو، لە ترسی ئەوەی کە خراپی نەکەمو بەیادەوەری بۆم بمێنێتەوە، لەسەر سەلاجەکە داتانناو قەڵەمێکی درێژ کە لە باخچەی ساوایان بە دیاری وەرم گرتبوو، بەدیوارەوە هەڵتان واسیو تا ئێستاش دەستم پێی نەکەوتووە، نیماش درێژەی پێداو گوتی: باشە، دەی منیش لەم شتانەم هەیە، وەکو قەڵەمو تۆپەکانی یادگاریو ئەو قەڵەمرەنگانەی کە هێشتا سوودی لێوەرنەگیراوە، من کە لەو حاڵەدا بووم، کە تاوانبارم بکەن، خێرا گوتم: ئەم شتانە کاتێك دەزانن، کە بگەن بە تەمەنی من، ئێمە بڕیارنییە تەواوی بیرەوەرییەکانمان لەناو ببەین، نازەنین بەنیگەرانییەوە گوتی: من نامەوێت کاتێك ئەوشتانە بزانم، کە گەیشتبمە تەمەنی ئێوە، سەیرێکی چاوەکانی نازەنینم کردو لەناو چاوی نیماو ئازادیش هەمان هەستی نازەنینم بینی، بێگومان حەق بەوان بوو، ڕەنگە لەم گۆشەیەوە، سەرنجی ئەم بابەتەم نەدابێتو ناچار گوتم: گوێ بگرن منداڵەکان من دەڵێم کاتێك ئێوە بە تەمەنی من گەیشتن، بینینی هەندێك لە شتەکان یادەوەریتان پێ دەبەخشێت، کە چ یادگارییەکتان هەبووە، هەستێکی خۆشتان پێ دەدات، ئەو ڕۆژەی کە ئێوە بە تەمەنی من دەگەن، من هاوتەمەنی داپیرەتان دەبم، ئەمە خۆی لە خۆیدا، بیرەوەری ساڵەکانی گەنجێتی منە، هەر کە ئەمەم گوت.. گریان گەرووی هەرسێکیانی گرتو سەیریان کردمو ئازاد لەناویاندا بۆلام هاتو لەباوەشی گرتمو خێرا فرمێسکی هاتە خوارێو گوتی: من نامەوێ ئێوە هاوتەمەنی داپیرەم بنو نازەنینو نیماش هەمان شتیان گوت، ئەوانم ئارام کردەوەو پێم گوتن: منداڵەکان ئەمەش بەشێکە لە ژیانی ئێمە، کەبە دەستی خۆمان نییەو بچووکەکان گەورە دەبنو من کەلەم تەمەنەدام شتێکم نییە لە ڕابوردووم کە لەبیرم مابێت، کاتێك لەتەمەنی ئێوەدا بوومو بەبیرم بێتەوە، نیما گوتی: هەر لەبەر ئەوەیە، کە دەفتەری وێنەی کاتی باخچەی ساوایانت بۆ من هەڵگرتووە؟ گوتم: بەڵێ، هەر بۆ ئەم مەبەستەیە کە دەڵێم: وەرن پێکەوە وێنەیەك بگرین، منداڵەکان ئیتر تاقەتی پێشوویان نەمابوو، نازەنین بەتووڕەییەوە گوتی: هەر لەبەرئەوەیە کە دەڵێم حەزم لەوێنەگرتن نییە؛ چونکە وێنە تەنها ئەوەت پیشان دەدات، کە تۆ وەکو پێشوو نەماویت، سەیرم کردو نازەنین بە نارەحەتی درێژەی پێداو گوتی حەزناکەم بیرەوەرییەکانم بەبیرم بێنمەوە، ڕۆژێك بگریمو بڵێم وەکو منداڵەکان جوان نیم ڕقم لە وێنەگرتن دەبێتەوە، نازەنینم لە ئامێز گرتو ئەو شتە ڕووی دا، کە نەدەبوو ڕووی داباو منیش لەگەڵ ئەو فرمێسکم ڕشت، ئەوانم لەباوەش گرتو بیرم لە قسەکانیان کردەوە، خۆشحاڵبووم بەوەی کە منداڵەکانی من زۆر شتیان دەزانیو من ئەوەم لەبیر کردبوو، کە ئەوانیش بیرەوەرییەکانی گەنجی منن!!!

سەرچاوە: مجلە خانوادە



بێگەرد فارس

# لە تورەییدا بڕیار مەدە!

پاش تێپەڕبوونی سێ ساڵ هاوسەرگیری، نەبوونە خاوەنی منداڵ، لەبەرئەوەی زۆر باوەڕیان بە ویستو ئیرادەی خودای گەورە هەبوو، بڕیاریان دا بەخێوکردنی منداڵێکی بێدایکو باوك لەئەستۆ بگرنو بیکەنە ئەندامێکی نوێی خێزانەکەیان، هەربەو جۆرەی بڕیاریان دا، منداڵەکەیان هێنایە ماڵەوەو زۆر گرنگییان پێ دەداو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر هۆگری دەبوون، بە جۆرێك خۆشیان دەویست، وەك بڵێی منداڵی ڕاستەقینەی خۆیان بێت، قەدەری خودای گەورە وابوو پاش تێپەڕبوونی ساڵانێکی کەم، خودا کوڕێکی پێبەخشینو بوونە خاوەنی منداڵی خۆیانو زۆر خۆشحاڵو بەختەوەر بوون، بڕیاریان دا منداڵەکەی دیکەش لای خۆیان بهێڵنەوەو پێکەوە بەخێویان بکەن.

ساڵان تێپەڕیو هەردووکیان گەورە بوونو بوون بە دوو گەنج کە پشتیان پێ دەبەستنو هیچ جیاوازییان نەدەکردن، ئەوانیش یەکیان زۆرخۆش دەویستو بەتێگەیشتنەوە مامەڵەیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد، تا ئەو کاتەی دایكو باوکیان بۆ سەردانیکردنی هاوڕێیەکیان چوونە دەرەوە، کاتێك گەڕانەوە بینییان کوڕە ڕاستەقینەکەی خۆیان دەگریو دەموچاوی خوێنی پێوەیە، زۆر ترسان شتێکی خراپ ڕووی دابێت، بۆیە بەخێرایی بەرەو لای چوونو لێیان پرسی چی بووە؟

دایكو باوکی زۆر تووڕەبوون، کاتێك زانییان برا گەورەکەی وای لێ کردووە، هەرچەندە لە هۆکاری لێدانەکەیان دەپرسی، وەڵامی نەدەدایەوە پرسیارکردن سوودی نەبوو، لەبەرئەوە دەریان کردو پێیان گوت: هەرگیز نەگەڕێیتەوە، ئەویش بە چاوی پڕفرمێسكو غەمێکی زۆرەوە ماڵی بەجێ هێشتو بەڕۆژدا لەسەر جادەو کۆڵانەکان، هەر شتێکی دەست بکەوتایە دەیخواردو شەوانیش دەگەڕایەوە بۆ باخچەی ماڵەوە؛ بۆئەوەی دایكو باوکی بەزەییان پێدا بێتەوە، هەرچەندە لێیان دەپاڕایەوەو داوای لێبووردنی دەکرد، گوێیان بۆ نەدەگرت.

ڕۆژێك باوکەکە گوێی لە گریانی کوڕە ڕاستەقینەکەی بوو، چووە لایو لێی پرسی: کوڕم بۆ دەگریت؟ خۆ ئازارت نییە؟ ئایا شتێك بێزاری کردوویت؟ کوڕەکەش گوتی: نەخێر، باوکەگیان هیچم نییە، بەڵام کاتێك سەیری براکەم دەکەم، زۆر دڵم پێی دەسووتێتو بەزەییم پێدا دێتەوە، باوکی بە تووڕەییەوە گوتی: ئەوە نە برای تۆیە، نە کوڕی منیشە، وازی لێ بهێنە با بڕوات، کوڕەکە گوتی: ئاخر باوکە ئەوەی ئەمگریەنێت نهێنییەکە، من لە تۆم شاردووەتەوە، تۆ نازانیت هۆکاری ئەوەی براکەم لە منی دا چی بوو؟ ئەویش گوتی: چی بوو ڕۆڵەگیان؟ کوڕەکەش بێ دەنگ بوو، پاشان بەگریانەوە گوتی: کاتێ ئێوە چوونە دەرەوە لە ماڵ، من قسەم لەگەڵ دەکردو گوتم: "هیوادارم باوکم تووشی ڕووداوێك ببێتو بمرێت؛ بۆئەوەی سەروەتو سامانەکەی وەربگرمو بە خۆشی بۆ خۆم بژیم! ئەویش زۆر تووڕە بوو، دەستی بە لێدانم کردو دەیگوت تۆ بمرە، بەس باوکم هیچی لێ نەیەت، دەستی بەگریان کردو گوتی: ئەگەر باوکم شتێکی لێ بێت، منیش لەگەڵ ئەودا دەمرم، ئەوم زۆر لە خۆم خۆشتر دەوێت، بێ ئەو ناتوانم بژیم"!

باوکەکە تووشی شۆك بوو، بە ڕاکردن بۆ باخچەکە چوو بەدوای کوڕەکەیدا بگەڕێ، زانی چ هەڵەیەکی بەرامبەر کردووە، بەڵام دوای چی؟! کاتێك گەیشتە باخچەکە، بینی کوڕەکەی لە برسانو لە سەرمان گیانی سپاردووە!

لەم بەسەرهاتەوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، پێویستە لەسەر هەموو یەکێك لە ئێمە، ژیرانەو دادپەروەرانە بڕیار بدەینو ڕێگە نەدەین هەستو سۆزمان کۆنترۆڵ بکەن، لەوانەیە بەهۆی وشەیەکی بریندارکەرەوە، داهاتووی کەسێك کە زۆر خۆشمان دەوێتو دۆعای خێرمان بۆ دەکات، لەناو ببەین.



# گرفتارم

ئەمن دەمگوت: لە دنیا تا بمێنم
لەبەر کەس، ئەستەمە، سەر دانەوێنم
کەچی ئێستێ، لە داوی بسکی تۆدا
گرفتارم، گوڵم، موو ناپسێنم

هێمن

هەمیشەو هەردەم بیرتەکەم، بەڵام ئێوارەکانی پاییز، زۆر زیاتر!

ڕووی خۆم، لەو پەڕە زەردانەدا دەبینمەوە، کە خەزان جوانەمەرگی کردن! هەناسەی تاسەم، لە چرپەی دواهەناسەی تاساوی ئەو گوڵانەدا دەبینم، کە کزەبای پاییز، پێڵووی چاوی جوانییان هەڵدەوەرێنێ!!

ئێواران کە سەرما، تێم دەئاڵێ، ئەوسا هەست بە تەنیاییەکی تاڵ دەکەم؟!

لە دووری تۆ، ڕووی بەهارم زەردە، دەتەوێ پاییزم چۆن بێ؟!

وتم: ئاوێکی ڕەحمەت،گەییە ڕۆحم ئاگری فیرقەت
وتی: لەم دۆزەخە، زەحمەت کەدەربێ هەرکەسێ تێکەوت -مەحوی-

شەوانە چراکان خامۆش دەبن، بەڵام چرای ئازارو بێداریو چاوەڕوانیی من، خامۆش نابێت! چرا دەنوێ، بەڵام چاوەڕوانیو تاسە نانوون!

ژیانی من، ئەو ڕۆژە دەستی پێ کرد، کە تۆم ناسی، ئەگەر جێم بێڵی، ژیانیش ماڵاواییم لێ دەکا!

چیم لێ دەکەی، بیکە..

لە هەموو شتێکم مەحرووم کە، لە نان، لە ئاو، تەنها لە ڕوخساری خۆت نا!

هەرکاتێکیش لێم زویربووی، نیگایەك بەسە بۆ ڕۆحکێشانی من، هەرگیز خۆت ماندوو مەکە!

لە غەمزەی چاوت، ئەبرۆ داگرەو بەس
مەکە بۆ قەتلی عاشق ڕەنجە، بازووت -مەحوی-

من ئامادەم، ڕۆحم لەسەر لەپمە، ئیشارەتێك بەسە بۆ تەسلیمکردنی ڕۆح!

نەخۆشی عیشقی لێوت، وەسیەتی کرد
بتاشن داری عونابی بە تابووت -مەحوی-

هەموو دونیات لە دەوربن ناتوانن تەنیایی ئەویندار بڕەوێننەوە جگە لە یار، چونکە لەنێو هەموو مرۆڤەکاندا، جگە لە یار کەس هەست بە وجودت ناکات، بۆیە تۆش هەست بە وجودی کەس ناکەیت!

ڕوحلەبەرێك نابینی جگە لە ئەو!

لەو صورەتی زیبات، کە ڕوحێکە موجەسسەم
وەك صورەتی دیوارە، ئەوەی ڕوحی لە بەردا -نەدەب-

ژیان بێ ئەو دۆزەخەو لە سێبەری قامەتی یاردا نەبێت، بۆنی بەهەشت ناکەی.

کەسێك بۆنی بەهەشتی کردبێو لەگەڵ ئەهلی بەهەشتا تێکەڵ بێ، ئیدی لەگەڵ ژیانی دۆزەخیدا چۆن هەڵ بکا!؟ ئیدی چۆن گڕی دووری نایسووتێنێ!

ئەگەر توبایە وەك تۆ، جەننەت ئارا
لە سایەی قامەتی تۆیە نیگارا -نەدەب-

گەیشتن بە جەننەتی ڕۆح، جگە لای عاشقان نەبێ، لە هیچ شوێنێ دەنگوباسی نییە کەس نەیدیوەو کەس نەیبیستووەو کەس نازانێ چی لەزەتێکە بۆ ڕۆحو چی حەیاتێکە بۆ دڵ!!

بۆیە ڕۆمی دەڵێ: «هاتووم سەرم دانێمو عیشقی تۆ بەرم، من بۆچ بە دنیادا بخولێمەوە، کە دۆست نیشتەجێی گیانی شیرینی منە!؟»

مەحویش بۆیە خەمی مردنی نیە، وەلێ حەز ناکا خوێنی لە گەردنی یار بێ!

دەترسم گەردی خوێنی من لە شیشەی گەردنت نیشێ
وەگەرنا غەم نیە بمرم، لە حەسرەت لێوی مەیگونت

ناری، داوا دەکا لێگەڕێن با یار بە غەمزەی چاوی خوێنی بنۆشێ! کێ خوا ئەوەی بە نسیب دەکا!؟

چاوی خوێنخواری بە خوێنم فێرە، وەك لێوی بەمەی
لێم گەڕێن ئێوەو خودا ئەو شۆخە با بیخواتەوە!

تەمەنێکە گرفتاری دیداری تۆم، وەرەو چیدی با شەوە درێژەکانی پایز لە باوەشی تەنیاییدا بەڕێ نەکەم!

با لە بری بۆنی مێخەکی گەردانەو عەبیری پەرچەمت دوکەڵی ئاگردانی دڵو هەنیسکی نیوەشەوو کزەی خەزان نەبێتە هاودەمم!

موددەتێکە من گرفتارم بەدەست سەوداتەوە
بووم بە داوی چینی زوڵفو پەرچەمی تاتاتەوە -ناری-

تۆ دەزانی بەخشینی هەموو خەونو خەیاڵت بە تەنها کەسێك، گیرۆدەبوونی خەیاڵ بە یادو زیکری ئەوو گرفتاربوونی دڵ بە تیری ئەوینێك کە ئەندێشە ناتوانێ بێ ئەو بژی، چەند سەختو دژوارە!

دڵ دەزانێ چۆن ڕێگای گەیشتە ئەم دەرگانەیە! بۆیە دایم مەستی دیداری مەعشوقی ڕۆحو تاقانەی دڵە!

لە مەیخانەی خەیاڵی شەوقی تۆدا
بە نەشئەی یادی تۆ، دڵ مەستە بێ مەی -ناری-

ئازیزم، هەرچەندە بە دووریت ئازارم بدەی، لێم بتۆرێیو دەرگای مەملەکەتەکەتم لێ داخەی، هەرگیز دڵم ناشکێو زویر نابم، لە پێناوی تۆدا بەرگەی هەموو دژوارییەکان دەگرم!

لە جەوری تۆ، دڵم نەشکاوە قەت من
عەجەب لەو شیشەیەی نەشکا بە خارا -نەدەب-

هەموو خۆزگەو ئاواتی من گەیشتنبوو بە سێبەری باڵات، موشەرەفبوون بوو لە غوڵامیی دەرگات، ئیدی چی دەبێ با ببێ شازادەی مەملەکەتی ئەوین.

بە قانونی غوڵامی گەر قبوڵم کا لە دەرگادا
لە چەتری عەیشو تەختی نازو، تاجی ئیعتبارم چی! -ناری-

گەرمیانی



# نامە نوورییەکان

## نامەی چل وشەش

لەژێر پرووشـــەی بارانەکەدا، بـــەرەو مزگەوت هەنگاوم دەنا، ســـەدای دەنگی "الله أكبـــر"، هاوڕێ بە شـــنەبایەکی هێمنو ئەو نۆبارانەی پاییز، گوڵاوپرژێنی ڕۆحیان دەکردم.

هەســـتم دەکرد، ئاســـمان هێندە نزیکە، خەریکە هەورەکان، ســـینگیان لە منارەی مزگەوتەکە دەخشـــێ. هەستم دەکرد، باران گوزارش لە بارینی ڕەحمەتی خودایی دەکات.

هەســـتم بە خەجاڵەتییەکی گەورە کرد، لەبری خۆمو لەبری هەمـــوو ئـــەو مرۆڤانەی کە ڕۆژانە، ئەم ســـەرزەوییە گوناهباران دەکەنو خوداش ڕەحمەتبارانیان دەکا!!

وای خودایە لە میهری بێسنووری تۆو ڕووزەردیی ئێمەی بەندە!

لە ڕۆژی عارفەدا، گوناهی دوو ساڵو لە عاشووراشدا، ساڵێکمان بۆ دەســـڕیتەوە! چی کەرەمێکی بێسنوورو چی دەریایەکی بێبنی میهرە، ئیلاهی!

ئـــای ئازیزم: خوداوەند، نـــەك بەندە تاوانبـــارەکان، بێهیواو ســـەرگەردان نـــاکا، بەڵکو چاوەڕوانـــی گەڕانەوەیانـــە! "تەوواب" دەیەوێت، تاوانباران تۆبە بکەن!

دەگێڕنەوە: خودای گەورە، سرووشـــی نارد بۆ داود پێغەمبەر (دروودی خـــودا لـــێ بێت)و پێی فەرمـــوو: ئەگـــەر یاخییەکان، ئاگاداری شـــەوقو تاســـەو ئـــارەزووم بـــۆ گەڕانەوەیـــان دەبوون، دەتوانەوە لە تاسەی گەڕانەوە بۆ لای من!

ئـەی داود، ئەمە ویسـتی منە بـۆ یاخییەکان، ئـەی دەبێ خۆشەویستیم بۆ ئەو کەسانە چۆن بێ، کە ڕوویان کردۆتە من؟!

لـە زەمانی مووسـا پێغەمبـەردا (درووودی خـودا لێ بێت)، بێبارانـیو وشکەسـاڵی، تەنگی بە بەنی ئیسـرائیل هەڵچنیبوو، مووساو قەومەکەشی، بۆ نوێژەبارانە چووبوونە دەرێ!

خوداوەند، سرووشـی بۆ مووسـا کـرد (درووودی خودای لێ بێت): ئەی مووسـا، لەنێو ئێوەدا، کەسـێك هەیە، (٤٠) ساڵە لێم یاخییـەو ملکەچی فەرمانم نابێ، بەهۆی ئەو کەسـەوە، بارانتان لـێ گیراوەتەوە، بانگەواز بکە؛ با ئەو بەندەیە بچێتە دەرەوە لە ڕیزەکە؛ تا بارانتان بۆ ببارێنم!

مووساش بانگەوازی کرد، بەڵام کەس نەهاتە دەرێو بارانیش باری!

مووسـا پێی سـەیربوو، کەس نەهاتە دەرێو بارانیش باری، ئەم سەرسوڕمانەی بە خودا گوت!

خودا فەرمووی: مووسا، ئەو بەندە یاخییە تۆبەی کرد!

مووسا فەرمووی: خودایە، ناوەکەیم پێ بدەو پێم بناسێنە!

خودای گەورەش فەرمووی: ئەی مووسـا، من کاتێك سـەترم کرد، ئەو تاوانی دەکرد، ئێسـتا کـە تۆبەی کردووەو گەڕاوەتەوە، ئابڕووی بەرم؟!

ئـەو کاتـەی هەمـوو دەرگاکان دادەخرێن، چـراکان هەموو دەکوژێنـەوە، وەلـێ دەرگای میهری خودایـی، هەرگیز داناخرێ، چرای هیوای خودایی، هەرگیز خامۆش نابێ!

لـە دژوارتریـن سـاتەوەختەژانی ژیانا، ئەو کاتـەی دڵ، لە کونـی دەرزی تەنگتـرە، کاتـێ ئاوڕ بـۆ لای خـودا دەدەیتەوە، دەبینـی نـوورو خەڵاتـی لێخۆشـبوونی خودایـی، چاوەڕوانتە! خوداوەنـد هێندە میهرەبانە، ئەو کاتە لێت زویر نییە، کە تاوان دەکەی، بەڵکو ئەو کاتە بە تەواوی زویربوون، لێت زیز دەبێ، کە لە بەزەیی ئەو خودایە، بێهیوا دەبیت!

لە ئەسـەردا هاتـووە، کە خوداوەند دەفەرمـوێ: " لە کەس تـووڕە نەبـووم، هێندەی ئەو کەسـەی تاوان دەکات، پاشـان لە بەرامبەر بەخشندەییی مندا، تاوانەکەی لا گەورەیە"

ئەمەش نابێت وامان لێ بکات، کە زێتر ئالوودەی گوناه بین، بەڵکـو دەبـێ، بەرامبەر ئەم فەیزە ئیلاهیو کەرەمە بێشـومارو میهرە بێسـنوورە، شەرم بمانگرێو سەر لە سوجدەی تۆبەکردنو پەشیمانی بڵند نەکەین!

ئیبنولقەیـم دەڵێـت: هەرگیز کەس لە خـودا، میهرەبانترو نەرمونیانتـر بـەدی ناکەی، سـوێند بـە خودا، ئەگەر سـاجید دەیزانی، چۆن بەخشـینو لێبوردنو ڕەحمی خودا دای دەپۆشێ، بەهۆی سوجدەبردنی، هەرگیز سەری بڵند نەدەکرد.

بۆنەوەی ئێمە دڵخۆشبین بە بەڵێنی خودایی، هەرگیز بێهیوا نەبین، خودا بە گەورەترین شێواز، وەسفی بەزەیی خۆی دەکا.

بـە﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ ﴾ و ﴿ تَوَّابٌ ﴾و ﴿ وَدُودٌ ﴾و ﴿ غَافِرِ الذَّنبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ ﴾ وەسفی خۆی دەکا!

لـە کاتێکدا خودا، هیچ باکی لـە بەندەکانی نییە، بەڵام ئاوا دەرگای سۆزو بەزەیی خۆی، خستووەتە سەر پشت!

ئیبنولقەیـم دەڵێـت: «جێی سەرسـوڕمان نییـە، غوڵامێك ملکەچی پاشـاکەی بێتـو لە خزمەتکردنی مانـدوو نەبێت، لە کاتێکـدا زۆر ئاتاجی بە ئەوەو هـەژاری بەردەرگاکەیەتی! بەڵکو عەجـەب ئەوەیە، خودایەك بەو هەموو گەورەییو دەسـەڵاتەوە، لـە بەنـدەو غوڵامەکانی نزیك ببێتەوەو بـە ئەنواعی نیعمەتو ئیحسـانی، خـۆی خۆشەویسـت دەکا لایـان، لـە کاتێـکا هیـچ پێویستییەکی پێیان نییە!»

لە هەموو شـتێ، سـەیرو عەجایەبتر ئەوەیە، کە ئەم خودا گەورەیە بناسی، وەلێ خۆشت نەوێ!

گوێبیسـتی بانگخوازەکە بیت، کـە پەیامبەرە، بەڵام نەچی بەرەو پیری!

بـڕی قازانجـی مامەڵەکـردن لەگەڵیدا بزانـی، وەلێ لەگەڵ غەیری ئەودا مامەڵە بکەی!

تووڕەیی ئەو بزانی، پاشان سەرپێچیشی بکەی!

تـاڵاوی تەنیاییو بێکەسـیی کاتـی یاخیبوون لـەو خودایە بچێژی، وەلێ هۆگری تاعەتی ئەو نەبی!

کاتـێ گوێگرتن بۆ غەیری وتەی شـیرینی ئەو، هەسـت بە دڵتەنگـیو خەمبـاری بکەی، بـەڵام بۆ دەرمانی دڵو سـوکنایی ڕۆحت، پەنا بۆ یادو موناجاتی ئەو نەبەیت!

هەست بە سزاو ئەشکەنجەو ئازاری پەیوەستبوونی دڵ بکەی بە غەیری ئەوو پاشـان ڕانەکەی بۆ بەهەشـتی گەڕانەوە بۆ لای ئەو خودا میهرەبانە!

ئیـدی با ڕانەوەسـتین؛ خـودا زۆر لە گومانی باشـی ئێمە، باشترە.. ناتوانین پەی بە میهرەبانی ئەو خودایە بەرین هەرگیز!

کابرایەك لە بەنی ئیسـرائیل (٤٠) سـاڵ خوداپەرستی کرد، پاشان (٤٠) ساڵ تاوانو گوناه، دواتر بەخۆی گوت: زۆر زەحمەتە ئەگەر تۆبە بکەم، خودا لێم خۆشبێ، هەرگیز شتی وا نابێ!

لەلایەن خوداوە، بانگ کرا لە خەودا:

ئەی فلانە کەس: خۆشت ویستین، خۆشمان ویستی!

گوێڕایەڵمان بووی، ئێمەش نزیکمان کردیتەوە!

لێمان یاخی بووی، مۆڵەتمان دای!

گەر بگەڕێیتەوە؛ قبووڵت دەکەینەوە!

ع.ش.شێرکۆ

# لەگەڵ شاری شاعیردا




شاعیر ناوی **عەلی عارف ئاغایە**، نازناوی شیعری "شاری"یە، ساڵی ١٩١٠، لە سلێمانی لەدایکبووە. خاوەنی دیوانێك شیعری جوانەو شیعرو هۆنراوەی جوانو ناسکی زۆرن، بەتایبەت لە شیعری "غەزەل"دا، دەستێکی باڵای هەبووە.

شاعیر ساڵی ١٩٩٧، لە شاری سلێمانی، کۆچی دوایی کردووە.

ئەمەش نموونەیەك لە شیعرەکانی:

## گوڵ و خونچە

گوڵو خونچەی بەهارانیش لە تۆ نەشمیلەتر نابێ
نەمامی عەرعەری کۆرپەش لە تۆ خنجیلەتر نابێ
لە عالەما لەتۆ چاتر، لە تۆ مەحبوبو شیرینتر
ئەگەر دەعواچییەك مابێ درۆ ناکا دەسا بابێ
دەسا با بێن بە صەف یەکسەر هەموو چاوەمستو گوڵڕوومەت
بزانین چۆن ئەبێ مەحبوب ئەوی وا لافی لێدابێ
درۆیە تۆ لە ئینسان بی ئەمە عەقڵم قبوڵ ناکا
پەریش حەدی نییە وابێ ئەبەد حۆریش بە تۆ نابێ
کەوابوو تۆ لە شوعلەی نوری پاکی صونعی یەزدانی
ئەبێ جێگای ئەصیلیشت عەتارد یا سورەییا بێ

## تۆ کە دەرکەوتی

تۆ کە دەرکەوتی لە ناو باغا گوڵی مینا چییە
یا لە چاو جوانی ئەتۆ شیرین چییەو لەیلا چییە
نرخی تۆ تەقدیر بە پارەو زێڕو ئەڵماس ناکرێ
بۆ فریشتەی ئاسمانی سەروەتی دنیا چییە
تۆ کە شازادەی جوانانی هەموو ئەم عالەمەی
کەس نییە لافی هەبێ میرو بەگ و ئاغا چییە
گیانی ئێمە پێشکەشی تۆ بێ قبوڵی گەر ئەکەی
بۆ دیاری گیانی بێنرخی منی ڕیسوا چییە

## ڕەوشتی خراپی ناڵەبارێك

دارێکی چاکەی قەت نەڕواندووە
کەچی ئەیبینی هەردەم ماندووە
سەروچاویشی هەر ترش و تاڵە
ئەڵێی مەعاشیان لێ فڕاندووە
دە پاکەت سیگار ئەدا بە دوکەڵ
چل پیاڵە چاشی هەڵقوڕاندووە
هەندێ جار ماتە بێدەنگ و وتار
هەندێ جاری تر زۆر نەزاندووە

لەگەڵ جنێودا زۆر ئاشنایە
بەرگی چاکبێژی زوو دڕاندووە
دڕك ئەچێنێ لە ڕێی خەڵکیا
سەری لە ئایین کەم لەقاندووە
ناحەز بە گەل و خەمی خۆیەتی
لە بۆ بێگانە خۆی تڕاندووە
پارە قەرز ئەکا کە نایداتەوە
بەرهەمی ڕاستی هەڵوەراندووە
خزمایەتی لای سووك و بێنرخە
شووشەی دڵپاکی تێك شکاندووە
مرۆڤی وەها مانی زیانە
گەرچی زیندووشە خۆی مراندووە
کۆشکی زۆر بەرزی کرداری چاکەی
بە پاچی بەدی هەڵوەشاندووە